- سەرەتایەک بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەکاری.
- نووسینی: حەسەن سلێمان.
- وەرگێڕان و پێشەکی و پەراوێز: نەژاد عزیز سورمێ.
- چاپی یەکەم: بەغدا **1986**– تیراژ**5000** دانە.
- چاپی دووەم: کوردستان–هەولێر**2005**.
- چاپخانەی: وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی کوردستان.

**حەسەن سلێمان**

# سەرەتایەک بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەکاری

نەژاد عزیز سورمی

کردوویە بە کوردی و
پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە

**چاپی دووەم 2005**

| ناوەرۆک | لاپەڕە |
|---|---|
| هونەری شێوەکاری .. بۆ؟ | 9 |
| سایکۆلۆژیەتی هێڵ | 21 |
| هونەر و سرووشت و مرۆڤ | 26 |
| لاکێشە و بازنەو چوار گۆشە | 34 |
| ڕێژەی زێڕین | 48 |
| هێڵە ئاسۆیی و شاوڵییەکان و ستوون بوونیان | 53 |
| مەودای سێیەم | 63 |
| هێڵی چەماوە | 72 |
| ئاوازەکانی هێڵ | 79 |
| ئاهەنگ | 88 |
| گونجان | 93 |
| ململانێی نێوان پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ | 96 |
| جوولانەوە لە هونەر و ژیاندا | 111 |
| بزاڤی پەرەسەندن لە زانست و هونەر و ژیاندا | 145 |
| جوولانەوە و شێوە ئۆرگانییەکان و پەیوەندی بە هونەرەوە | 153 |
| جوولانەوەی بایۆلۆژی و کاری هونەری | 169 |

| ناوەرۆک | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ئاهەنگ و هاوسەنگبوون لە جوولانەوەدا | 184 |
| جوولانەوە و قوتابخانە هونەرییە هاوچەرخەکان | 190 |
| جوولانەوە وەک دەروازەیەک بۆ تێگەیشتنی کاری هونەری | 195 |
| زمانی شێوەی هونەری | 205 |
| دەروازەیەک بۆ رەگەزی ململانێ لە کاری هونەریدا | 211 |
| هێڵ و بۆشایی | 223 |
| ساوی بۆشایی و رووەکان | 239 |
| گیروگرفتی بۆشایی و روو لە قوتابخانە هونەرییە نوێیەکاندا | 257 |
| رەگەزی دەستخەڵەتدان و لێڵی لە کاری هونەریدا | 275 |
| پەیوەندی هونەرمەند | 289 |
| هونەر پێویستییەکی مرۆڤایەتییە | 307 |
| پەراوێز | 325 |
| پاشکۆی تابلۆکان | 335 |

# هونەری شێوەکاری.. بۆ؟

(1)

بەجیا باسکردنی هونەری شێوەکاری، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم هونەرە (بەگشت لقەکانییەوە)[1] لە لقەکانی دیکەی هونەر لێک دەکرێنەوە..

ئەوەندەی زیاتر پەیوەندی بەوە هەیە، کە بێجگە لەوەی بەر لە پەیدابوونی نووسینەوە هەیە، یەکەمین هۆی دەربڕینی ئادەمیزادی دێرینیش بووە لە پێش مێژووی پەیدابوونی نووسینەوە مابێتەوە و پێمان گەیشتبێ[2]و گەلێک لایەنی ژیانی ئەوان سەردەمە دێرینانەی بۆ یەکالا کردبینەوە، هەر ئەمەش سیماو ئادگارێکی دیکەی بەم هونەرە داوە، رۆڵێکی گرنگ لە شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا ببینێ، بەوەی زمانی شێوە لە زمانی نووسین راستگۆترە..!

خەڵکی کە دەئاخڤن یا دەنووسن تەواو ئاگایان لە زمان و قەڵەمی خۆیان دەبێ و ئەوە دەزانن کە گوێیان لێ دەگیرێ و دەخوێندرێنەوە بۆیە دەبینین زۆرشت دەشارنەوە، یا بە بەڵگە و هەنجەتی دوور لە راستیەوە دای دەپۆشن.. یا هەر بەنهێنی دەیهێڵنەوە، بە تایبەتیش

له هەندێ لەو مەسەلانەی (پەیوەندیان بە ئایین و نەریتی ئەو کۆمەڵەوە هەیە، وەک بەشێک لە ئەرکی ڕێزلێنانی خوداوەند و بە هەند هەڵگرتنی[3].
بەڵام نیگار کە بەزمانی هێڵ و ڕەنگەوە بۆمان دەدوێ، بواری ئەوەی تیا نییە، بەم جۆرە (هونەر تاقە مێژووی ڕاستگۆی مرۆڤە)[4] دیسان زمانی هونەریش زمانێکە گشت مرۆڤێکی ئەم گۆی زەوییە تێی دەگا، وەکی دی ئاشکرایە زمانی ئاسایی باوەکو هۆیەکی پێکگەیشتن و تێکگەیشتن بێ، هەر سنووردارە و لە بازنەیەکی دیاریکراودا ناچێتە دەرەوە و (هەر لە سنووری ئەو کۆمەڵە دەمێنێتەوە لە زمانەکە دەگا.. وەلێ کە بمانەوێ لەو سنوورە ڕەت بکات، دەبێ پەنا بۆ بەکارهێنانی تەکنیکی ئاڵۆزی وەرگێڕان ببەین.. چەندی هونەرە، لەگەڵ ئەوەی سیما نیشتمانییەکەی پێوە دەبێ، بەڵام زمانێکە هەموو مرۆڤایەتیش تێیدەگا..)[5].
لێرەدا هونەر بایەخێکی گرنگی دیکەشی دەبێ، بەوەی بێ سنوورە، ئەگەر لە پاڵ هەموو لقەکانی تری هونەریشەوە بەشداری لە شارستانییەتی مرۆڤایەتی کردبێ، سەبارەت بەو بێ سنوورییەشیەوە لە لقەکانی تری(وەکو ئەدەب) جیای دەکاتەوە، ئەوە ئەگەر باسی جیاوازی هۆیەکانی دەربڕین نەکەین، کە لە هونەری شێوەکاریدا زیاتر هێڵ و ڕەنگ و هەندێک پێوانەی ئەندازەیی دەور دەبینن، کەچی لە ئەدەبدا زمان و نووسین دەوری سەرەکیان هەیە. هەر بەو هۆیەشەوە هونەری شێوەکاری ڕۆڵێکی چاکی لە بەرەو پێشبردنی هونەری بیناسازی (ARCHITECTURE) دا دیوە، نەک وەک کەلاوەرۆژنە و ڕوانگەیەک، بەڵکو هەمیشە لایەنی ئیستاتیکی زانستی ئەندازە بووە، بەمەش خزمەتێکی بەرچاوی مرۆڤایەتی کردووە و دەورێکی باڵایشی لە لایەنی سایکۆلۆژی و وەبەرنانی هەستی مرۆڤایەتی لە

ئادمـــیـــزاد دا دیوە و کـــاری لە رەفـــتـــاریدا کـــردووە... وەک ئەوەی بەشداری لە بەرهەم هێنان و پەرەسەندنی لایەنی جوانکاری شێوەی زۆربەی زۆری ئەو کەلوپەل و شتومەکانە هەبووە کە مرۆڤ بەکاری دێنێ، لە جل و بگرە تا دەگاتە شێوەی هۆیەکانی بەرهەم هێنان و دامەزراوە پیشەسازی و بازرگانی و پەروەردەیی و هاتوچۆو.. تاد.

شان بەشانی لقەکانی دیکەی داهێنانی مرۆڤایەتیش بەشداری خەباتی مرۆڤی کردووە لە پێناوی ئازادی و وەدیهێنانی ژیانێکی ئاسوودەیی بێ چەوسانەوە، وێڕای ئەوەی بەدرێژایی مێژوویشەوە شایەدێکی راستگۆی چاخەکان بووە، بەوەی ژیان و گوزەرانی و باری مرۆڤی بۆ بەرجەستە کردووین(6)... مەگەر مرۆڤی ئەم سەردەمەمان بەهۆی ئەو وێنە و کـــۆڵـراوانەی دیواری ئەشکەوتان و دۆزراوە ئارکیۆلۆژییەکان (زانستی شوێنەوارناسیی) نەبوایە، چی لە بارەی ئەوان شارستانییەتە پێشکەوتووانە دەزانی کە لە دێرزەمانەوە هەبوون، تەنانەت ئێستاش رۆژ بە رۆژ هەر بەهۆی بە دواداچوون و پشکنینی ئارکیۆلۆژی شتی تازەمان بۆ دەرکەوێ.

(2)

بە داخەوە دەڵێم لە لای ئێمە تاکو ئێستا کە باسی هونەری شێوەکاری دەکرێ لەوە زیاتر نییە، کۆمەڵێک تابلۆ یا چەند داتاشراوێک لە هۆڵێک پیشان دەدرێن و خەڵکی دێنە تەماشایان، کە دەشهێنە تەماشا، یەکسەر لە روانگەیەکی ئەدەبی رووتەوە سەیری کارە هونەرییەکان دەکەن و هەر بەو جۆرەش لێکی دەدەنەوە، بەرادەیەک بینەران ئەوەندەی خۆیان بە ناوونیشانی کارە هونەرییەکانی نێو کەتەلۆکی پێشانگاکە دەبەستنەوە، ئەوەندە بە تەنگ پێکهاتە و رەنگ و لایەنی پێکهاتن و جوانکاری دیکەوە نین تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی هەندێ جار داوا لە هونەرمەند دەکەن

مانای ئەم تابلۆ یا ئەو داتاشراویان بۆ لێک بداتەوە!!
ئەمەش زیاتر بە هۆی نەبوونی هۆشیاریی هونەرییەوەیە کە ئەویش بەرەنجامی چەند هۆیەکە، لە پێش هەمووشیانەوە شێوازی تەقلیدی پەروەردە و فێرکردنی هونەر لە قوتابخانە و خوێندنگاکان و بایەخ نەدان بە مێژوو و دەوری هونەر لە ژیان و شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا. دیسان بە هەند هەڵنەگرتنی هونەرمەند وەک داهێنەرێک، جا ئەگەر هونەرمەند لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا مەڵبەندێکی گەشی تیشکاوێژی شارستانییەتی بێ و بەو چاوەوە سەیر بکرێ، ئەوا لە کۆمەڵگای دواکەوتوودا وەکو کەسێکی دواکەوتوو لە ژیاندا دەژمێردرێ، ئەمەش لە خۆیدا کۆسپێکی ترە، هەر بەهۆی هونەرمەندەکان خۆیان (سەبارەت بە گەلێک هۆی جۆراوجۆر، دەوری پێشڕەوی خۆیان لە بیر دەچێتەوە و وەک پێویست هەست بە لێپرسینەوە ناکەن).. دەخاتە بەر بەرەو پێش چوونی هونەر، بەوەی بۆ زەوق و میزاجی چەند کەسانێک جەماوەری حەقیقی خۆیان دەدۆڕێنن و لە بۆچوون و روانینی ئەو کەسانە نزیک دەبنەوە کە هونەر بە وەخت بردنەسەر و ئارەزوویەکی لابەلایی تێدەگەن. نەبوونی چاپکراوی بەردەستیش کە تایبەت بێ بە هونەر، وەکو رۆژنامە و گۆڤار بە کوردی، هەروەها نەبوونی رەخنەی هونەری، کۆسپێکی دیکەیە.
ئەمڕۆ زۆربەی ئەوسەرچاوانەی لەم هۆنەرە دەدوێن بەزمانی بێگانەن و لە هونەری ئەو نەتەوانە دەدوێن، ئەمەش بووە بە هۆی ئەوەی هونەرمەندانی کورد بخاتە ژێر کاریگەری هەندێ رێبازی هونەری ئەوروپا، کە بەهیچ شێوەیەک هونەری کوردی لە پاشەرۆژدا سیمای رەسەنی خۆی تیا نادۆزێتەوە. دەبێ ئێمە بزانین کە (هونەری جیهانی) مانای ئەوە نییە هونەرمەند لە جەوهەری مەسەلە و واقیعی کۆمەڵگا و کولتووری خۆی نامۆ بێت و دوور بکەوێتەوە.



**نموونەیەک لە دەسکردی ئادەمیزادی دێرین کە بەسەر دیواری ئەشکەوتانەوە ماوەتەوەو مێژووی وێنەکێشانی لە (15-20) هەزار ساڵ لەمەوبەر کەمترنییە.**

ئەوەتا گـەلێک هونەرمـەندی ئەم رۆژهەڵاتە سـوودیان لە رێبـازە هونەرییـەکـانی ئەورووپا وەرگـرتووە، بەڵام لە سـەر حـیسـابی رەسـەنایەتی هونەری و مـۆرکی واقـیـعی خۆیانەوە نەبووە، بۆ نموونە هونەری هیندی و ژاپۆنی..

(هونەرمـەندی هیندی ئەگـەر سـوودیشی لە هونەری ئەورووپایی وەرگـرتبێ مـۆرکی تایبـەتی و ناسـراوی خـۆی نەدۆڕاندووە، بەڵای کـەمەوە لە لایەنی ئەو زمـانە شـێوەییـەی پێی رووبەڕووی جەمـاوەر دەبێـتـەوە. هونـەرمـەندی ژاپۆنیش هەر بەوجـۆرە، لەگـەڵ باروزروفی ژاپۆن و چۆکدادانی لە شەڕی دووەمی جیهـانیداو سەپاندنی گەلێک رواڵەتی شـارسـتـانیـیـەتی نوێی رۆژئاوا و خـوێندنی هەزاران لاوی ژاپۆنی لە ئامـۆژگـا و ئەکـادیمیـای هونەرە جـوانەکـانی رۆژئاوا، لە مۆرکی کەلەپووری ناسراوی خۆیان جیانەبوونەتەوە)[7].

بەم جۆرە هونەرمەندی کورد لە هەلومەرجی ئێستـادا کە زیاتر ئاو لە سەرچاوەی هونەری رۆژئاواوە دەخواتەوە، ئەگـەر بیەوێ دڵسـۆز بێت بۆ هونەرەکـەی، پێـویسـتـە ئەوەی لە بەرچاوبێ چۆن دەگـاتـە ئەوەی سیـمـا و مـۆرکی تایبـەتی هونەری کـوردی بدۆزێتـەوە کـە پێـیـەوە بناسـرێتــەو[8]، ئەوەی لەبەرچاو بێ بۆ کێ رەسم دەکـا و لەوە وردبێـتـــەوە ئەو رێبــازە هونەرییــانەی ئەورووپا چۆن و لە چ هەلومەرجێکدا سەریان هەڵداوە..

هونەرمەندی کورد بە مە زیاتر سیـمای رەسەنی خـۆی دەدۆزێتەوە و شـایەدێکی راسـتگۆی سـەردەمـەکـەشی دەبێت و مـێژوویەکـیش بۆ هونەری گـەلەکـەی دروست دەکـا کـە نەوەکـانی دوارۆژ شـانازی پێـوە بکەن وەک ئەوەی ئێـسـتــاش ئەورووپای رۆژئاوا بگـرە هەمـــوو مـرۆڤـایەتیش شـانازی بە هونەرمـەندانی سـەردەمی بووژانەوە (رێنیسانس) دەکەن.

(3)

لەچاو باروزروفی هونەرمەندی کورد و نەبوونی رەخنەی هونەری، بە بەراورد لەگەڵ لقەکانی تری هونەر، بۆ وێنە شیعر، هونەری کوردی بەرەو پێش چووە، ئەو بەرەو پێشچوونەشی لەسەردەستی کۆمەڵێک هونەرمەند بووە چ لە



کوردستان یا لە دەرەوە. وەکی دی لەتەک ئەمەدا سەرچاوەیەکی چاپکراوی ئەوتۆمان نییە بە کوردی دەربارەی ئەم هونەرە چ وەک مێژوو یا یەکالاکردنەوە و تێگەیشتنی چەمکی تەکنیکی و توێژینەوەی رێبازەکانی.

بۆیە بە بڕوای من هەر هەوڵێک لەم روانگەیەوە بدرێ بە نووسین بێ یا وەرگێڕان لە دوو سەرەوە سوودی دەبێ:

یەکەمیان وەکو بابەتەکە (ناوەڕۆکی بابەتەکە) خۆی کە کتێبخانەی کوردی پێویستی پێی هەیە، دووەمیشیان وەک هۆیەک بۆ چەسپاندنی گەلێک زاراوەی وا کە سبەی رۆژێ سوودێکی زۆری بۆ قامووسی کوردی و زمانەکەمان بەگشتی دەبێ. لێرەدا دەتوانین لە قۆناخی یەکەمدا بەو ئەنجامە بگەین نەک هەر بە تەنیا لە رێگای هونەر، بگرە بەهۆی گەلێک لایەنی تریشەوە کە رۆشنبیری کوردی

پێویستی پێیان هەیە، وەکو فەلسەفە و زانستی دەروونناسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و زیندەوەرزانی و ئەندازە و ئەستێرەناسی و..تاد.
ئەم هەوڵە بچکۆلانەی منیش هەر لەم گۆشەنیگایەوە بووە.. هەرچی چۆنێکە وەرگێڕانی کتێبێکی وا دەشێ کارێکی ئاسان نەبێ، هەرچی نەبێ بەهۆی ئەوەی نووسین و وەرگێڕانی لەم بابەتە یا هەر نەبووە، یا کە هەیشبووبێ، بەو چەشنە نەبووە زمانەکەمانی لێ راهێنرابێ و زاراوە پێویستییەکانی چەسپاندبێ وەک ئەوەی لە زمانەکانی تر چەسپێنراون. لە کۆتاییدا ئەوەی دەبێ بگوترێ، ئەمەی بەردەستتان بریتییە لە کتێبێک کە دەقە ئەسلییەکەی بە سێ بەش بڵاوکراوەتەوە، هەر بەشێکیان لە دوو تویی کتێبێکی قەوارە نیو بەتاڵ دایە.. کە ئەمانەن:
* بەشی یەکەم (کتێبی یەکەم) بەناوی(سیکولوجیة الخطوط)ـە و 16ی مایسی ساڵی 1967 لەلایەن(دار الكاتب العربي للطباعة و النشر) لە میسر بڵاوکراوتەوە.
* کتێبی دووەم(الحركة في الفن و الحياة) ساڵی 1969 هەر لە هەمان دەزگا بڵاوبووەتەوە.
*کتێبی سێیەم (لغة الشكل الفني) ساڵی 1970 لە دەزگای (الهيئة المصرية العامة للتاليف و النشر) دا بڵاوکراوەتەوە.
ئەم سێ بەرهەمەش کە دەکاتە ئەم کتێبەی بەردەستتان گەلێ کاری هونەری و وێنەی روونکردنەوەیان تێدایە کە زۆربەیان لەبەر لێڵی و کاڵییەوە لە چاپ دەرنەدەچوون بۆیە ماوەیەکی زۆر خەریکی پەیداکردنیان بووم کە هەندێکیان بەداخەوە پەیدا نەبوون و بەناچاری دامنانەوە.



**هونەری ژاپۆنی کە قوتابخانەو ڕێبازە هونەریە تازەکان نەیانتوانی**
**کاری تێ بکەن و مۆرکی ڕەسەنی بگۆڕن**

دیسان هەوڵم داوە:

1- لەبەر زۆری وێنەکان چاو لە هەندێکیان بپۆشم، بەتایبەتیش ئەو وێنانەی زانیومە کار ناکەنە سەر ناوەڕۆکی باسەکان.

2- زیاتر وشەی کوردی بەکار بهێنم، ئەوانەی کە بەراستم زانیوە چونکە لەو باوەڕەدام ئەگەر ئەمڕۆش نامۆ بن دەگونجێ لە دوارۆژدا وەکو هەر وشەیەکی دیکەی باو و رەسەن جێی خۆیان بگرن.

3- ئەو زاراوە و ناوانەی تێیان دابووە و نووسەر روونی نەکردوونەتەوە و من بە پێویستم زانیوە بۆ خوێنەری کورد روونیان بکەمەوە، لەبەشی پەراوێز (کە لە پاشکۆی کتێبەکەدایە) روونم کردوونەتەوە. بەتایبەتیش کورتەی ژیاننامەی ئەو هونەرمەندانەی ناویان لە کتێبەکەدا هاتووە. بێجگە لەو پەراوێزانەی لە شوێنی خۆیاندا هاتوون.

4- لەلایەنی دەربڕینەوە، زیاتر لەو قالبە نزیک ببمەوە کە دەربڕینی کوردی بەبەردا دەبڕێ، ئەمەش هەندێ جار بووە بەهۆی پاش و پێش خستنێک بە گوێرەی رستەی تێکستە ئەسڵییەکە.

هیوادارم توانیبێتم مەبەستی نووسەر بگەیەنم.



**حوزەیرانی 1984**

## پەراوێز

1- مەبەست لە لقەکانی هونەری شێوەکاری: وێنەکێشان Painting و بیناسازی Archi-tecture و سەنگتراشی sculpture بە هەر سێ جۆرەکانییەوە، هەروەها هونەری نەخش و نیگار Decoretive

2- لەم سی چل ساڵەی دواییدا لە یەکێک لە ئەشکەوتەکانی هەرێمی باکووری ئیسپانیادا هەندێ وێنەی ئاژەڵان دۆزراونەتەوە کە بۆ چەرخی بەردین دەگەڕێنەوە.

3- بڕوانە حەسەن سلێمان - الفنان ذلك الانسان- گۆڤاری (الفنون)ی میسری ژمارە3ی هاوینی ساڵی 1971 ل64.

4- هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل72 .

5- بڕوانە: گرۆمۆڤ و کاجان - وظيفة الفن الاجتماعية- وەرگێڕانی (عدنان مدانات) دار ابن خلدون ل 121 .

6-کاری هونەرمەندانی وەکو داڤنیشی و مایکل ئەنجیلۆ و رامبرانت و برۆژیل و گۆیا و دێلاکرواو کۆربێ و ڤان کوخ و پیکاسۆ و دەیانی دی گەواهی ئەوە دەدەن.

7- بڕوانە - جمال قطب- الاصالة و عناصر التذوق الفني - گۆڤاری الدوحة ژمارە 60 - 1980.

8- ئەم مەسەلەیە باسێکی دوور و درێژ هەڵدەگرێ کە لێرەدا هەڵبەتە جێگای نابێتەوە، بەڵام ئەوەی پێویستە بگوترێ ئەوەیە کە ئێمە بە هیچ جۆرێک مەبەستمان لەوە نییە هونەری کوردی لە هونەری مرۆڤایەتی بکەینەوە. یا پێمان وابێ هونەرمەندی کورد سوود لە تاقیکردنەوە دەوڵەمەندەکانی هونەری رۆژئاوا وەرنەگرێ! ئەوەندەی بەتەنگ ئەوەوەین هیوامان بەوە بێ لە پاشەرۆژدا هونەری کوردی لەنێو هونەری رۆژهەڵاتدا بناسرێتەوە و سەنگ و بەهای خۆی هەبێ.

**تێبینی:**

**وێنەکانی لەگەڵ ئەو پێشەکییە داندراون بە پێی پێویست خۆم دامناون.**

**وەرگێڕ**

**بەشی یەکەم**
**سایکۆلۆژیەتی هێڵ**

# بەرایی



**وێنە(1)**

ئەگەر هەندێ لە نووسینەکانی دەوری بەرێ هەڵبوێرین، وەک تێڕامانەکانی لیناردۆ (داڤنیشی) دەربارەی – ئەو بەرزی و نزمییەی لە پەیوەندی هێڵە جۆراوجۆرەکان و بەرزی و نزمییەکانیانەوە پەیدا دەبێ– دەبینین تێگەیشتن و

هەڵسەنگاندنی وێنە لە سەدەکانی رابوردوودا بە چەمکی ئەدەبی و فەلسەفییەوە بەسترابووەوە، بەڵکو ئێستاش هەندێ نووسین لە قاوخی ئەو چەمکە ناچنە دەرەوە.
ئەمەش سەبارەت بە جێگیربوونی ئەو بڕوایەی لەهۆشی خەڵکیدا بووە بەوەی هەر وێنەیەک یا دەبێ هەواڵێک بگەیەنێ یاخود چیرۆکێک بگێڕێتەوە.
هەرچەندە ئەمەش ماوەی چەند سەدەیەک یەکێک بووە لە فەرمانەکانی وێنە، بەڵام تاکە فەرمانی هونەر نەبووە.
بارەکە لاسەنگتریش بوو کە فەیلەسووفەکان تیۆرەکانی خۆیانیان دەربارەی (بوون)ـەوە بنیات دەنا، پاشان هەوڵیان دەدا دەرگا و بەرهەڵێک بۆ ئەو تیۆرانە ببیننەوە تا بەسەر فەلسەفەی جوانیی بسەپێنن.
هەڵبەت لێرەدا ئەو ماوەیەمان نییە لە تیۆرەکانی فەلسەفەی جوانی و پەیوەندی بە چەشە وەرگرتنی هونەرییەوە بدوێین. بەڵام گرنگ ئەوەیە دەستنیشانی ئەو هۆیانە بکەین کە یارمەتی گۆڕینی رێبازی تێگەیشتن و تێڕامانی خەڵکی داوە بەرامبەر بەکاری هونەری، لەکاتێکدا هونەرمەند وەختی گرتنی رێبازێک لە کێشانی وێنەی شتێکدا، وای دەردەخست کە "خۆی وای هەست پێدەکا". چەند هۆیەکیش رێگایان لە دانانی دەستوورێک بۆ زمانی شێوە خۆش کرد، بەجۆرێک وای لێهات هونەرمەند و ئەوەی کە چێژیشی لێ وەردەگرێ بگەڕێنەوە سەریان، بەبێ ئەوەی بە چەند مەسەلەیەکی باوەڕپێکراوی بژمێرن.
دیارترینی ئەو هۆیانەش ئەمانە بوون:
1- نووسینەکانی مارکس - ئەنگلز و لێدوانیان لەدیاردە و

شتەکان بە چەمکێکی زانستیانە، وەکو لێدوان دەربارەی هۆ و ئامانج و فەرمان و ماددەی بەکارهێنراو و بەستنەوەی ئەمانەش هەمووی بە واقیعی ماتریالی و مێژووییەوە.
2- لەلایەکی دیکەوە نووسینەکانی (رسکن) کە لەو بڕوایەدابوو شتێک هەیە پێی دەڵێن دەستخەڵەتدانی هەست، واتە ئێمە شتەکان وەک خۆمان بە بوونەوەری زیندوو دەبینین یا خۆمان دەقەبەریان دەکەین و وا هەست دەکەین لە سرووشت داین و تەنانەت خۆمان لە بنەچەی کارێکی هونەری رووتیشدا دەبینین.
من دان بە راستی ئەو بۆچوونانە دادەنێم، بەڵام ئەو نەیتوانیوە بەڵگەیەکی زانستی بە تیۆرەکەی بدات.
بەم چەشنە دەست براو پەردە لەسەر نهێنی کاری داهێنانی هونەرییەوە لابرا، تا ئەوەی کۆمەڵێک لە هونەرمەندە پێشەنگەکان لە ساڵی 1919 دا ئامۆژگایەکیان لەئەڵمانیادا کێل کردەوە. هاتن مشتومڕیان لەسەر زمانی شێوەدا کرد و هەوڵیان دەدا بگەنە ئەوەی گرێ کوێرەکانی بکەنەوەو دەستوورێکی بۆ دابنێن.
جا ئەگەر ئێمەش باسی ئەو زمانە و ئەوان مەسەلانە دەکەین، لەم بەرچاوخستنەدا تەنیا بە بیروڕای ئەو پێشەنگە مەزنانە ناوەستین، لەوانیش پرۆفیسۆر ئاتان و پاشانیش هونەرمەندان پۆڵ کلێ و[1] کاندنسکی و [2] نووسینەکانی هاربرد رید [3] لە ئینگلستان و ئەزنفان لە فەرەنسا و هەروەها هی ویلنسکی و روجر فرای.
من خۆم بە بیروباوەڕی ئەوانە نابەستمەوە، من لە بواری ئەو بیروڕایانەوە روانین و ئەزموونی تایبەتی خۆم دەردەبڕم،

بەتایبــەتیش ئایدیالیــزمی ئەوان پێــشــەنگانە ژێربێــژێتی (مەنتیقی) لاواز کردبوون و نووسینەکانیان لە چوارچێوەیەکی تەومژاویدا گیر کردبوو.

●

# هونەرو سرووشت و مرۆڤ

هەروەک ئەو زمانەی کە ئێستا لە پێکهاتووەکانی دەدوێین پێشان خۆی لەو دیو لاسایی کردنەوەی سرووشتدا دزیبووەوە، یا بەواتایەکی تر، خۆی لە پشت لاسایی کردنەوەی هونەرمەند نابوو کە واقیعی بینراوی دەردەخستەوە.
ئەم زمانەیش لەلایەنی ئاهەنگ و هاوسەنگییەوە، تا رادەیەکی زۆر پاڵی بە یاسایەکانی سرووشتەوە دابوو، چونکە بە هەستی مرۆڤەوە دەنووسێ، کە ئەم هەستەیش هەزاران ساڵە بە ئەزموونی بەر هەستییەوە پێی راهاتووە، دیسان بەرەنجامی یاسای ئاهەنگ و هاوسەنگ بوونیشە کە فیسیۆلۆژیەتی ئادەمیزاد و گشت بوونەوەرێکی زیندووی لەسەر بنیات دەنرێ و تەنانەت بە یاساکانی هاوسەنگبوون و ئاهەنگی ئەستێرەکانی ئاسمان و پەیوەندی ناوەخۆی ئەوانیشەوە بەستراوەتەوە.
سەرەتایش لەگەڵیدا هاتنەوە گونجان، یا بڵێین هەست و نەستی مرۆڤانەی پابەندی ئەو یاسایانە بوو، ئینجا پاشان ئادەمیزاد پێی زانین و دۆزینیەوە، لێرەدا پێویستە ئەوەیش لەبەر چاوبگرین

کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان لێکۆڵینەوەی بنەماکانی هونەر و شوێنکەوتنی تەواو و چوونە ژێرباری چەند یاسایەکی دیاریکراوو ئەو ئاگادارکردنەوانەدا هەیە کە هەمیشە (کلێ) بەر لەوەی دەست بە باسەکانی بکا دەیدرکاندن، بەوەی ترسی لەوەیە قوتابییەکانی بکەونە بەر داوی ئەکادیمیەتێکی تازەوە کە ببێتە هۆی راگرتنی بیرو هەستیان.

کەچی ئەم ئاگادارکردنەوەیە بێهوودە بوو، پێشبینییەکەیشی بەراست دەرچوو، وای لێهات گەلێک هونەرمەند بەم ئەکادیمییەتە تازەیەوە بەسترانەوە.

هەرچۆنێک بێ، با ئاشنای ئەو زمانە ببین کە بە سرووشت و یاساکانییەوە بەستراوەتەوە، سەربەستیشین لەوەی بەکارمان هێنا یاخود رەتمان کردەوە.

خۆبەستنەوەی لە ئەندازەبەدەریش بەهیچ جۆرێک نامانگەیەنێتە ئەوەی لە وێنەیەک بگەین یا وێنەیەک بکێشین، بەڵام دەشێ یارمەتی ئەوە بدات قووڵتر لە کاری هونەری بگەین. کەسایەتی هونەرمەندیش لەوەدایە، چۆن ئەو یاسایانە هەڵدەبژێرێ و کارە هونەرییەکەی لەسەر بنیات دەنێ، جیاوازی ئەو یاسایانەش لە هونەرمەندێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازییەکی بەرفرەیە، بەڵام لە نێوان دوو کاری هونەریدا بەرتەسکترە، کە هەردووکیش دەسکردی هەمان هونەرمەند بن.

•

با لە سادەترین شتی ئەم سرووشتە بدوێین. پنت (خاڵ ونوختەیشی پێدەگوترێ- وەرگێڕ)- یا چەند- پەڵەیەکی بچووک.
کێ لە ئێمە پنتێکی لەنێو لمدانە دیوە کە بەرەبەرە گەورە بووە و تا بووەتە پیاوێک یاخود ئاژەڵێک بەرەو رووتەوە دێ. - بڕوانە وێنە-3



وێنە(3)

کێ لە ئێمە لەو دڵۆپانە ورد نەبووەتەوە کە بەسەر میناى پەنجەرەدا دێنە خوارێ، یا پۆلە کۆترى نەدیوە لە شینایى ئاسماندا دەبن بە چەند پنتێکى رەش و تا بەتەواوى لێدەچنەوە.
یا لە پەنجەرەوە دەڕوانینە چەند پنتێکى بزێو، دەڕوانینە رێبواران کە خەریکى کۆششن.
ئەمانە بەشێکن لە روانینە هەمیشەییەکانماندا بە درێژایى رۆژ، دەسکەوتى هونەرمەندیش لەسەرجەمى ئەو روانینە بەردەوامانەى ژیانمانەوە پێک دێ.
جا کاتێ ئەو هونەرمەندە پنتێک یا پەڵەیەک دەخاتە سەر کاغەز، ئەو پنتە یا مانایەکى هێماییمان دەداتێ، یاخود روانینێکى بیناییمان بۆ رەنگ دەداتەوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا یاسایەکى ئەندازەییمان بۆ دەسەلمێنێ، فەرمانیشى بە گوێرەى تابلۆوە بەلاى چاکە دایە، چونکە بەرێکەوت نەکەوتووەتە جێگاى خۆى بۆ ئەوەى بوونەوەرێک یا فۆرمێک دەرببڕێ کە مانایەکى هەواڵ ئامێزى بەخۆوە گرتبێ.
هەرچى لە ژیانیشماندا کە لەوێنەى هەمەچەشنەدا دەیبینین لە هۆشى ناوەوەمانى دا دەکەین (خزن)، هەرکە دەشیبینین سووک و ئاسان بە هێمایەک یا چەمکێکى دەبەستینەوە، وەلێ ئەو هێما و چەمکانە لەوانە نین بێنە دى ئەگەر ئەو پنتە یا ئەو پنتانە یاسایەکى ئەندازەیى یا ماتماتیکى لە پەیوەندیان بە رووبەرى لاپەڕەکەوە دیارى نەکردبن، ئەگەر وا نەبێ ئەو پنتانە ناتوانن هیچ هەستێکى حەسانەوەمان بدەنێ یا مانایەکى دیاریکراومان پێ رابگەیەنن لەپچڕپچڕى و یەک ئەنوایییەوە بەدەر. بڕوانە وێنەى (4).

# سایکۆلۆژیەتی پێنت



وێنە(5)

1- دەشێ پێنت کونێک بێ- بڕوانە وێنەی 2 .

2- دەشێ پێنت قەبارەیەک بێ- بڕوانە وێنە 5 .

3- لەوانەیە رووبەڕێ بێ.
4- دەشێ منالّیی شتێک بێ.
5- دەگونجێ ئاوابوونی شتێک بێ.
6- یاخود چەند هێزێک بێت، لە ئەنجامی هێزی دیکەی ناوەندی راونەرەوە لێک پچڕابێ.
7- دەشێ پنت مەلّبەندێک بێ و چەند هێزێکی تێدا کۆببێتەوە، بەواتا ببێت بە مەلّبەندی کۆکردنەوەی رووکاری هێلّەکان، لەم بارەیدا پنت فەرمانێکی پاشڤەبڕی* (سلبی) دەبێ، ئەو هێز و رووکارانەی دەور و بەریشی رۆلّێکی پێشڤەبڕیان (ئیجابی) دەبێ بڕوانە وێنەی (6).
8- لەوانەیشە پنت ببێ بە مەلّبەندێکی پڕشنگدان، لێرەدا



**وێنە 6**

*( پاشڤەبڕ بە «سلبی»و پێشڤەبڕم بە «ئیجابی» بەکارهێناوە بەپێی شوێن و لێوەشانەویشەوە هەندێ جار نێگەتیڤ و پۆزەتیفم بەکار هێناوە-وەرگێڕ).

بەهایەکی پێشڤەبڕی دەبێ، بەڵام ئەو زەمینەی لێی دەردەقوڵێ و هەروەها بۆشایی دەوروبەری دەبن بە چەند هێزێکی پاشڤەبڕ-بڕوانە وێنەی (7).



وێنە(7)
مەڵبەندی پرشنگدان
(لێرەدا پنت هێزێکی پاشڤەبڕە)

•

## لاکێشە و بازنە و چوارگۆشە

وێمان (پنت) دەشێ رووبەرێک بێ یاخود منالێی شتێک، لە پاشانیش لەوانەیە بازنەیەک یا چوارگۆشە یا لاکێشەیەک بێ.

# چوارگۆشە



وێنە(8)

زۆر جار شێوەی جیاجیا و هەمەچەشن لە سرووشتدا دەبینین، لەگەڵ ئەوەی هەندێ جار ئەو شێوانە لەبارەی پێکهاتنیانەوە بە ئاڵۆزی دەردەکەون، بەڵام ئێمە هەرزوو بەهۆی فۆڕمی گشتییانەوە دەتوانین شێوەکانیان دیاری بکەین. ئەوجا دێین لێی دەدوێین تا دەستنیشانی ئەوە بکەین کە تا چ رادەیەک بەدڵمانە و پێی دڵخۆش دەبین، یاخود چەندمان لەبەر دەبێزرێ و لێی دوور دەکەوینەوە.

لێرەدا دەبێ هەڵوەستەیەکی بۆ بکەین و لەخۆمان بپرسین:

داخۆ شێوەی جوان بەچی ڕا دیارە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش کە گەلێک جار لەخۆمانی دەکەین، ئەوەی دەوێ بگەڕێینەوە سەر شتە داکراوەکانی مێشکمان.

کەواتە با دەست پێبکەین و لە شتێکی ساکار بدوێین، با ئەو شتە سادەیە (چوارگۆشە) بێ.



وێنە(9)



وێنە(10)

بێگومان چوارگۆشە نیشانەی سەقامگیری و رەخسیوبیە، چونکە لایەکانی یەکسانن و گۆشەکانیشی وەستاون، چوارگۆشە هەم زادەی بازنەیە و هەم پێشیەوە بەندە، بەڵام چەندی چوارگۆشەیە لە گرووپی (راستەهێڵ)انە.

جا ئەگەر ئەو پەیوەندییە هێڵ ئامێزانەی کەلەوانەیە وێنەی (11،10،9،8)ی لێ بخولقێنین، کە لابخەین و هەردوولایشمان درێژ کردنەوە، بەواتا چوارگۆشەیەکی دیکەمان



وێنە(11)

لە تەنیشت چوارگۆشەکە دانا، لاکێشەیەکی لێ پێکدێ، لەهەمان کاتیشدا دەکرێ پەیوەندە شێوەی زیاتریشی لێ پەیدا بکەین و دەربهێنین.

لەوکاتەدا فۆرمەکە، جوانتر و دەوڵەمەندتریش دەبێ- بڕوانە وێنە (12)، چونکە حەتمەن بە گوێرەی پەیوەندی (بەش) بە (گشت)ەوە کەرت و پارچەی دەوڵەمەندتری تێدا دەبێ.



وێنە(12)

کاتێک (پانی)یش لەگەڵ دەرهاوردەیەکی ئەندازەیی (درێژی) دا یەکسان دەبێ، وەک نیوە، یا سێیەک، یاخود چواریەک، ئیدی ئێمە لەو ریزگەرییە دوور دەکەوینەوە کە لە یەکسانبوونی درێژی و پانی شێوەدا پەیدابووە، بەڵام لاکێشەکەمان راستەوخۆ لە وێنەی دوو یا سێ چوارگۆشەی تەک یەک دێتە بەرچاو.

## بازنە

بازنەیش وەک چوارگۆشە، فۆرمێکی بنچینەییە و سیفەتی تەواوی خۆی هەیە، دەبێ ئەوەیش لەبەرچاوبگرین کە رووکەشی ستاتیکی، تەنانەت شێوەیشی بەهۆی چێوەی دەوروبەرییەوە



وێنە(13)

کاری تێدەکرێ. ئێمە ناتوانین بڵێین، چێوە، بازنەکە دیاری دەکا، چونکە ئەوی راستییە ئەوەیە، رووبەرەکانی لە بۆشایی دەوروبەری جیا دەکاتەوە، ئەوەیش لەبەر ئەوەی هێڵی دەرەوەی نرخێکی سەقامگرتووی نییە.



وێنە(14)

بەڵکو هەمیشە وامان لێدەکا هەست بە جوولانەوەی بکەین، بڕوانە وێنە (16،15).

بازنە لە پێکهاتنی ئەندازەییدا هەژارە، بۆیە ئێمە لەگەلێک وێنەدا دەبینین کە ئەگەر هونەرمەند ناچار بوو بازنەیەک دابنێ، تەماشا دەکەی سەبارەت بە نابەروێکی شێوەیەوە دەیشکێنێتەوە



**وێنە(15)**



**وێنە(16)**

وەک ئەوەی بەشێکی لە پشت رووبەرێک یاخود فۆرمێکی دیکە دەشارێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەی رووکەشێکی هەژاریشی هەیە، بەڵام دەوڵەمەندیشە، چونکە توانستی دروستکردن و دەرهاوردنی زۆرە، هەر بۆ نموونە شێوەی هێلکەیی یەکێکە لە دەرهاوردەکانی بازنە کە نەختێک لەخۆی ئاڵۆزترە، لەبەر ئەوەی بەرەنجامی گەلێک تەوەرەیە- بڕوانە وێنە (17-18).

شێوەی هێلکەییش لەبەرچاوماندا ئاسوودەترین شێوەی بازنەییە،



وێنە(17)



وێنە(18)

چونکە لەو شێوە ئەندازەییە بەدەرە کە چاومان پێی راهاتووە و پەیوەندیشی پێمانەوە زێترە بەوەی لەشێوەی ئەندامێکی لەشمان دەکا- بڕوانە وێنە (19).
بە کورتی شێوەی بازنەیی و دەرهاوردەکانی بناغەی گشت بوونەوەرێکی ئۆرگانی زیندووی ئەم بوونەن، دانەوێڵە و بەروبووم و گوڵ و گوڵاڵە و هێلکە شەیتانۆکە، گشتیان بۆ سەر بازنە و



وێنە(19)

دەرهاوردەکانی (مشتق) دەگەڕێنەوە، کە لەوەیشدا زیاتر بە خانە و ئاوڵەمە (جنین) و سێکسەوەمان دەبەستێتەوە. بڕوانە وێنەی (20، 21، 22، 23، 24، 25،26، 27).

لەشێوەکانی دیکەش زیاترمان لێخۆش دێت و پێی ئاسوودە دەبین، ئەوەتا بەبێ وەستاندن و بێ ئەوەی سەرەتا و کۆتاییشی لێک بکەینەوە و نیگامان بەسەرچوارچێوەی دەرەوەیدا تێدەپەڕێ- بڕوانە وێنە (28).

## لاکێشە

هەر کاغەزێکی وێنە و نیگارکێشان بگری لاکێشەیە، چونکە وەکو وتمان چوارگۆشە لەلایەک بە گوێرەی دەرهاوردەکانییەوە سنووردارە، لەلایەکی دی ئەو پەیوەندییانەی وەبەریشمان دێنێ سنووردار دەبن، وەکی دی لەلاکێشەدا بۆ بەکارهێنانی رووبەر، سەربەستییەکی تەواومان هەیە، بەدرێژیی بێ یاخود پانی، چۆنمان بۆ بلوێ یان چۆنی بابەتەکە بیەوێ.
کاتێ ئەندازیارێکیش نەخشەی خانوویەک دەکێشێ، ئەگەر کون و کەلەبەری لاکێشەی تیا بەکاربێنێ بە ئاسانی دەتوانێ شان و شەوکەتێکی پێ بدا، چونکە:

پەنجەرەی لاکێشە، لەچوارگۆشە زیاتر هاوسەنگی بە هێڵە ئاسۆییەکانەوە دەدا، خۆ ئەگەر شایەد ئەندازیارەکە ناچار بوو چوارگۆشە یاخود شێوەیەکی لە چوارگۆشە نزیک بەکار بێنێ، سەیر دەکەین هەوڵ دەدا، بەهۆی چەند هێڵێک کە دەیانکاتە چەند لاکێشەیەک زەقیەکەی دەمرێنێ و لەو فۆرمە (کە فۆرمی چوارگۆشەیە) دووری دەخاتەوە.
لە رێکخستنی ژووریشدا خوانی لاکێشە لە هی چوارگۆشە

چاکـــتـــره، چونکه دەتوانین بە ئاســـانی وا بکەین لای درێژایی (گەورەتری) لەگەڵ یەکێک لە چوار دیواری ژوورەکە تەریب بێن. زۆربەی هەرە زۆری کـتـێـبـانیش لاکـێـشـەیە، ئەمـەش نەک هەر سـوودی لە هاوڕێژەبووندا هەیە، بەڵکو لە فـەرمانیـشـدا. چونکە کتێبی لاکێشە بەتایبەتیش ئەگەر گەورە بێ گرتنی ئاسانتر دەبێ



وێنە(29)

تەنانەت ئەگەر بەکراوەییش بێ. (بڕوانە وێنەی (29)).
دیســان نزیکتــرین شـێــوەش کــە (ڕێژەی زێڕین Golden Section دابین دەکا لاکێشەیە، هیچ لاکێشـەیەکیش نییە کە پێی ئاسوودە بێن ئەگـــــەر پابەندی ئەو ڕێژەیە نەبێ، بڕوانە وێـنـەی (32،31،30).



وێنە(30)



وێنە(31)



وێنە(32)

وێنەیەک هونەرمەند هەستی خۆی بەهۆی لاکێشەوە دەرپڕیوە

# ڕێژەی زێڕین
Golden Section

کە نیگارکێش دەست بە وێنەیەک دەکا ، هەوڵ دەدا رووبەرەکە بۆ چەند ریژەیەکی سەرەتایی دابەش بکا ، هەمیشەش دەبینین هەندێ لەو هێلانە لەگەڵ (لا)یەکی وێنەکەدا تەریب یاخود شاولی دەبن.
بەدرێژایی مێژووی هونەر نیگارکێشەکان لە دانانی هێڵی ئاسۆیی نێوەڕاستی رووبەر دوورکەوتوونەتەوە و پەسندیان نەکردووە و خۆیان لێدزیوەتەوە.
ئەو شوێنەی هێڵە ئاسۆییەکەیشی لێ دەکێشرێ زۆر شت لە وێنەکەدا دیار دەکا ، ساکارترینیان ئەوەیە ، کە لەسەریەتی "رووبەر" بکاتە دوو بەش، ئاسمان و زەوی، هەربەوپێیەوەش فەرمانی هەر بەشێکی دەستنیشان دەکا و ئەم چەمکەیش دیاری دەکا کە وێنەکە پێشانی دەدا.
دەبێ سەرنجی ئەوەیش بدەین کە ئەگەر هاتوو چوارگۆشەیەکمان کرد بە دووبەشی یەکسان، هەمیشە بەشەکەی سەرەوە لە بەشی

خوارەوە گەورەتر دەردەکەوێ، هەستی ئەوەیشمان وەبەر دەنێ کە بەشی سەرەوە جێی لە بەشی خوارەوە تەنگ کردووە.
جا ئەگەر هاتوو لەو هێڵە ستوونی و ئاسۆییانە دواین کە رووبەرێک دابەش دەکەن، پێویستە باسی رێژە یاخود کەرتی زێڕین Golden Section بکەین.
ئێمە بە گوێرەی توانا تەقەللا دەدەین بە هەندی نەگرین بۆ ئەوەی خوێنەر لەوەدا بەسەهو نەچێ کە لەم یاسایە بەدەر هیچ یاسایەکی تر نییە بەراوردی جوانی چەند رووبەرێکمان بۆ بکا، هەر چەندی ئێمە دان بەوەشدا دەنێین، لە زۆربەی کارە هونەرییەکاندا وێنە بێ یا بیناسازی، لە ژێر رکێفی ئەم رێژەیەدان.
رێژەی زێڕینیش لە رێژەی (5/3 بۆ 8/5 بۆ 13/8) دا دەرناچێ، یانی رێژەی ئەو پەیوەندییانەی کە لە دەرهاوردە ئەندازەییە سادەکاندا دوور دەکەونەوە، بۆ نموونە (2/1 بۆ 4/2



وێنە(33)

بۆ 8/4 بۆ 16/8 و.....تاد). بڕوانە وێنە (33)
دیسان ڕێژەی زێڕین لە شیکردنەوەی کاری هونەرمەندە بەناوبانگەکانیشدا بەکەڵکمان دێ، لەگەڵ ئەوەی تاکە دەستووری نێو پەیوەندییە یەکخراوەکانیش نییە چاکتر ئەوەیە توێژەر یاخود قوتابی، بەپێی توانا لە هەموو پەیوەندییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خوردبێتەوە کە تێیان هەڵدەنگوێ، نەک هەر بەتەنیا لەکارە هونەرییە نەمرەکان و دروستکراوە بیناسازییە مەزنەکان رابمێنێ، دەبێ لە شتە سادەکانی دەوروپشتمانەوە بدوێ و لێی وردبێتەوە، وەک پەیوەندی درێژی بە پانییەوە، لە زۆربەی کتێب و دەرگایان دا، هەروەها سرنجدانی دابەشبوونی نووسین لەدوو توێی کتێبدا، یا ڕێژەی دەرگاکە و تێگرتنی مینایەکی لاکێشە.
ئەم شتانە کە یاسای گەورەشمان نادەنێ بەڵام زەینمان روونتر دەکەن و هێزی سرنجدانمان لەو پەیوەندیانەدا پتر دەکەن کە لە پاشانیش بە ئاسانی چێژیان لێ وەردەگرین، ئەمەش سەرەنجامی ستوون بوونی هێڵی شاوڵییە بەسەر ئاسۆییدا، ئەو پەیوەندییانەی هونەرمەندی ئەبستراکتی (مۆندریان) [4]. وێنەکانی لەسەر بنیات دەنا. بڕوانە وێنەی(34). یا ئەو پەیوەندییە ئەندازییانەی دەرهاوردەی سادەیان هەیە و لە کۆکردنەوەی هەندێ تەڵیشەداری دەرگایەکی ئیسلامیی کۆندا دەردەکەوێ.
بە قووڵی تێوەڕامانی شتە سادەکانی ژیانی ڕۆژانەمان، تاقە دەروازەیەکە بۆ پەروەردەکردنی هەستی هونەریمان. بڕوانە وێنە (35) و (36).



**وێنە(34)**

**تابلۆیەکی ئەبستراکتی–هونەرمەند پییت مۆندریان**



وێنە(35)

کاتدرایەکی قووتی

چەند درەختێک



وێنە(36)

ساختمانێکی نوێ

شانەی هەنگ

# هێڵە ئاسۆیی و شاوڵییەکان و ستوون بوونیان

ئەوەی تاقیکردنەوە سایکۆلۆژییەکانمان پشتی پێ دەبەستێ، هەستکردنمانە بە ستوونی و ئاسۆیی- بڕوانە وێنە (37).
هێڵی ستوونی هەستی هێزی هەڵکشاومان دەداتێ و وامان لێدەکا هەست بەهەمان ئەو ژیان و نەشونمایە بکەین کە لە رووەکاندا دەیبینین و هەست بەسەرکەشییەک دەکەین. هێڵی ئاسۆییش سیفەتی زیندووی پتر تێدایە. لەکاتێکدا هێڵی ئاسۆیی هەمیشە لەگەڵ پاڵدانەوە و نووستن و حەسانەوە و مردنەوە پێلۆز دەکرێ.
کاتێ دوو هێڵیش لە یەک کاتدا دەبینین، یەکیان ستوونی و ئەوی دی ئاسۆیی، ستوونییەکە درێژتر دیار دەبێ.
دیسان هەر هێڵێکی ئاسۆیی دەگری راکشانی خاک و ئاومان بەخەیاڵدا دێنێ، لەگەڵ ئەم لێک بەستنەوەیەشدا هێڵەکە کورت دەبێتەوە، بەڵام ئێمە کەیفمان زیاتر بە هێڵی ستوونی دی،

چونکە بەرەو ڕووی یاسای کێشی زەوییەوە ڕادەوەستێ، سەرنجیش دەدەین لە دیمەنەکانی سرووشتیشدا هێڵە ستوونییەکان لە هێڵە ئاسۆییەکان خێراترن، دیسان هەر بەهۆی هێڵە ستونییەکانیشەوە زێتر درک بە شتان دەکەین، کێشەی بیناسازیش، کێشەی هێڵە ستوونییەکانە.



وێنە(37)



وێنە(38)

کە هێڵێکی ستوونی لەسەر کاغەزێکدا دەکێشین لە ویستی بیناسازەکە زیاترە، کە ئەمەیش بە درێژایی مێژووەوە هەروابووە بۆ گەیشتنی بە دابینکردنی ئارەزووەکانی، ئەویش ساختمانەکە بەرز بکاتەوە بێ ئەوەی گوێبداتە سەنگی ماددە بەکارهێنراوەکان و کێشی زەوی، بڕوانە وێنە (38).

جوانیی بینای ساختمانیش بەوە بەندە، کە ئێمە تا چەند هەست بە هێزی رەگداکوتانییەوە دەکەین. بڕوانە وێنە (39).



وێنە(39)

بینا لە تەیمانەیەکی چڕی نەخشە ستوونی و ئاسۆییەکانیەوە پێک دێ کە یەک لەگەڵ ئەوی دی ستوون دەبن و بەگژیەکدا دەچن.. ئەم هێڵانەش لەگەڵ چەشنێکی دیکەی هێڵە ستوونییەکان جیاوازن، وەک دارتێلی کارەبا و تەلەفۆن، چونکە ئەو هێڵانە ئەگەر هێڵی ستوونیشن و بەرەو رووی هێڵی (زەوی)یش راوەدەستن، بەلام هەستی رەگداکوتانمان وەبەر ناهێنن، سەبارەت بە رێکبوونیشیانەوە هەست بە ونبوون ناکەین، وەک ئەو هەستەی پەڵەگیای پەرت و بلاوی نێو پارچە زەوییەک وەبەرمان دێنێ، چونکە ئەوان هێڵی رووتن و هێزی ململانێیان دەبەردا نییە. بڕوانە وێنەی (40).

ئەگەر بهاتبایە ئەو هێڵانە وێنەی شوورەیەکی رێکخراوو بەیەکەوە بەسترابووانەوە ئەوا بە بەبینینیان ئاسوودەتر دەبووین، لەوەی کە دارتێلی پەرش و بلاوو لێک دوور ببینین، چونکە نزیکی دارتێلەکان لەیەکتری و پێکەوە بەسترانیان ئاهەنگێکی (ئیقاعی) بەردەوامان دەداتێ.

وەلێ ئەوەندەش هەیە کە ئەو ئاهەنگە، ئاهەنگێکی وەرس کەرە، لەبەر ئەوەی یەک هەوایە، گرنگترین شتیش کە مۆسیقا بە نیگار دەدا، دەوڵەمەندیی هەمەڕەنگی و جۆراوجۆری هێڵەکان و پەیوەندییان بە یەکترییەوە، هێڵی ئەستوور بە هی باریک و هی خاو بە گوێرەی هێڵی پتەو و هێڵی تۆخ و پەیوەندی بەهی کاڵ و هی کورت بە هی درێژەوە.

لەگەڵ ساکاری نەخشەی وێنە (41 و 42) سەرنج دەدەین وێنە (42) لە وێنە (41) دەوڵەمەندترە، سەبارەت بەوەی هێڵەکانی جۆراوجۆرن.

ئێمە کە تەماشای نیگارێک دەکەین، نابێ چەمکی بینراوی تەنیا لە ڕێگای هێڵەکانییەوە ببینین و باوەڕی پێ بکەین، وەک ئەوەی دارتێلی کارەبا و تەلەفۆن دەبینین، بەڵکو پێویستە لە



وێنە(41)



وێنە(42)

هەمانکاتیشدا هەست بە بەهای شێوەکاریی خودی خۆشی بکەین وەکو ئامرازێک لە داهێنانی هەیکەلێکی ئاهەنگاوی تەبا..
بەم جۆرە ئەو خاڵانەی کە لەم بەشە و هەموو بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا باسمان لێکردووە، لەو مەبەستەبەدەر نییە کەلە تێڕامان و لێدوانی کاری هونەری یارمەتی خوێنەر دەدا.
نەخشە وپێکهاتنی وێنەش بەتەنیا پابەندی هێڵە ئەندازەییە وشکەکان نییە، کە چەند راهێنانێکی جەبری وەکو (س=ص) سنووریان بۆ دادەنێ، بەڵکو ئەو شتانەش دەگرێتەوە کە بەهۆی پشکنین و تێڕوانین و لێ خوردبوونەوەی بەردەوام هەستیان پێدەکەین و هەستی جوانیشمان بەهۆی تاقیکردنەوە و توێژینەوە گەشە پێدەدەین. سکێچی بەرکەماڵی تابلۆش تەنیا پشت بە زانینەوە نابەستێ، بەڵکو پشت بەو هەستەش دەبەستێ کە دەرەنجامی ئەو درێژی و پانییەیە. هونەرمەند لەکاتی لێکۆڵینەوەی سرووشتدا لێی خورد دەبێتەوە.
خۆبەستنەوەی هونەرمەندی دێرین بە سرووشت نرخ و بەهایەکی کلاسیکی نەمری بەکارەکانی داوە، بۆ نموونە بەهای جوانی هەیکەلەکەی وێنە (43) تەنیا لەو هاوسەنگبوون و جوانییەیدا نییە بەڵکو لەو هەستە ناسکەدایە لۆچی قوماشە شۆڕبووەوەکەی تراشیوە، کە دژ بە جوولانەوەی لەشە هەڵکشاوەکەیە. ئەوە هەستی ناسکی سرووشتە توانیویەتی بگاتە ئەوەی ناکۆکی نێوان لەشی لووسی ئافرەتەکە و کورنیشکی هێڵە سانایییەکانی کە لەزەوییەوە کێل دەبنەوە و دەستیشی لە ژێر لۆچە نیمچە رێکەکانی قوماشەکە بەرز کردۆتەوە و نایەڵێ شۆڕ بێتەوە، لەکاتێکدا لەدەستی بەردەبێتەوە.

جا ئەگەر بمانەوێ بزانین هەستی هونەرمەندی دێرین تا چ رادەیەک بە سرووشت گەیشتووە و راستگۆیانە دەری بڕیوە با سەیری وێنە (44) بکەین، دەستێک نایەڵێ لۆچی قوماشەکە شۆڕببێتەوە، ئینجا بێین لەگەڵ لۆچی قوماشی هەیکەلەکەی وێنە (43)ی بەراورد بکەین.

•

# مەوداى سێيەم

هێڵى ئاسۆيى بە مەوداى يەكەم دادەندرێ، هێڵى ستوونيش كە لەگەڵ هێڵى ئاسۆييدا شاوڵ دەبن بە مەوداى دووەم. بەڵام ئەو هێڵانەى لەنێو وێنەكەدا لار دەبنەوە و قەوارەيان لە پنتى نەمانى سەر رەوتى ئاسۆ لێ دەچنەوە، پێى دەڵێن مەوداى سێيەم- بڕوانە وێنە (45).

لەگەڵ لێچوونەوەى قەبارەى نێو وێنەكەيش، ماوەو قەبارەو ململانێى نێوان رووناهى و سێبەرى سەر (تەن)ـە كێشراوەكان




**وێنە(45)**

کەم دەبنەوە، هەروەها هەستکردن بە (چڕی و کێشیش کەم دەبێتەوە) بڕوانە وێنەی (46).
فەرمان و بەهای مەودای سێیەم ئەوەیە، پەیوەندی نێوان (کات) و (ماوە) دیاری دەکا و دەبێ بە پێوەری گشتیشیان- بڕوانە وێنە (46)، لەم وێنەیەدا دەتوانین ماوەی کاتیی و درێژیشی دیاری بکەین کە دالآنەکە بڕیویەتی تا بەوسەری گوزەرەکە گەیشتووە.

## سایکۆلۆژیەتی مەودای سێیەم

پلە بە پلە لەبەرزیبیەوە بۆ نشێوی.
پلە بە پلە لە بەهێزییەوە بۆ لاوازی.
پلە بە پلە لە توندوتیژییەوە بۆ هێمنی.
پلە بە پلە لە قورساییەوە بۆ سووکی.
پلە بە پلە لە پتەوییەوە بۆ خاوی.
بڕوانە وێنە (46).
دەشێ مەودای سێیەم ماوەیەکی ساتەوەختی بێ، لەوانەشە ماوەیەکی بەدرێژی بێ یا هێڵێکی ئەندازەیی، دەشێ بەردەوامی بارستەیەکی رووەو ئاسۆمان بداتێ، کەواتە دەگونجێ هەستی بەردەوامبوونمان بەرەو نەبوون و دیماهی نەهاتن پێ بدات.
یا لەوانەیە تەکاندانی هێزێک بێ کە بەهۆی بەردەوامییەوە بێهێز



وێنە(46)




ئەبستراکتی وێنە(46)

ببێ.
مەودای سێیەم لەوانەیە ماوەیەک دەرببڕێ، کەواتە رەگەزی ئەو مەودایە بەواتە کات یان ماوە، دەگونجێ لەگەڵ بارستەیەکی دووردا ببن بە لایەکی ململانێ، لایەکەی تریشی ئەو بارستەیەیە کە لە پێشەوەی وێنە (47)دایە، چونکە بارستایی و ماوە هاورێژەیەکی پێچەوانەیی پێک دێنن.
هێڵە ستوونییەکانیش لەگەڵ ماوەدا هەر بەو چەشنەن- بڕوانە



وێنە(47)

وێنە (47) و (48).
هێڵی ئاسۆ بەرزی و رێژەی شتەکان دیاری دەکا- بڕوانە وێنە





**وێنە(48)**

**بارستە گەورەکەی لای دەستەچەپ = بە بارستە بچووکەکە ئەوەی کە لە پاشکۆی وێنەکەدایە، دەستەراست + ڕەگەزی کات و ماوە.**



**وێنە(49)**

**هێلی ئاسنی شەمەندەفەر**

(48)و (50). بەرزی شتەکانیش ماوە دیاری دەکا- بڕوانە وێنە (46) و (48) و (50).

مەوداکان لەگەڵ ماوەدا هاوڕێژەیەکی پێچەوانەیی پێک دێنن، هێڵە ئاسۆییەکانیش لەگەڵ ماوەدا هەربەوجۆرەن.

مەودای سێیەم وەکو حەقیقەتێکی دەسخەڵەتدانی بینایی و واقیعی کات و ماوەیە.







وێنه(50)

## سایکۆلۆژیەتی هێڵ

هێڵ هەرگیز بۆشایی دەرنابڕێ، بڕوانە وێنە (51).
هێڵ دەربڕی جەمسەرانە.
هێڵ وەک بنکەیەکە، سەرەتایە.
هێڵ ناکۆکانیش لێک جودا دەکاتەوە، "بوون و مردن، شەو و ڕۆژ".
هێڵ دەربڕی لێوارانە، (دەربڕی کەندەڵان).
هێڵ وەک هاوسەنگ بوونێکی سایکۆلۆژی، واتە وەک هێمایەک بۆ گۆڕینی رەنگ "لێککردنەوەی دوو رەنگ". یا هێمایەکە،



وێنە(51)

خــواست و ناخــواست، دیار و نادیار، بوون و نەبوون، دیماهی هاتوو و بێ پایان "هێڵی ئاسۆ" لێک دەکاتەوە.
هـێڵ رابـەری بیـنـایـیـــــە. وەک رێژەیـەکی ئـەندازەیی و وەک پێناسەکردنی سادەترین شت.
هێڵ تەواوبوونی فۆرم Form دەچەسپێنێ.
هێڵ ئابلوقـەی بۆشـایی دەدا، بە واتا بۆی دەبێــتـە چوارچێــوە (رۆخەکانی پەنجەرە).
هێڵ وەک ئەنجـامی پاڵەپەسـتـۆو تەکـاندان، بڕوانە وێنە (52) بەواتا ئەنجامی شتێکە لە جوولانەوەدا، یا جوولانەوەی شتێک



وێنە(52)

- وێنە(52).

هێڵ بەردەوامی جوولانەوەیە بە مانای رووتی جوولانەوە و (هێڵ) بەوەی لەگەڵ رێچکەی جوولانەوەدا یەکسانە.

هێڵ وەک تەکاندانی وزەیەکی چالاک- وێنە (52).

هێڵ وەک دەرپەڕینی پنتێک - وێنە (52).

ئەگەر هەموو ئەو واتا فەلسەفی و رەمزییانە بخەینە لاوە، دەبینین زۆر لە بنیاتنراوەکانی دەستی مرۆڤ، لە رووخساردا ناوەڕۆکێکی هێڵ ئامێزیان هەیە وەکو (ئانتێنی رادیۆ و تەلەفزیۆن و تێل و تێلدرِ و سیمی کارەبا و ژێی ئامێرە مۆسیقییەکان و وەکو ژێی قانوون و پیانۆ).

ئێمە هێڵ لە هەموو شتێک، لەهەموو شوێنێکدا دەبینین، لە

ڕێگەوبانان، لە کارگەکاندا، لە ئێستگەی شەمەندەفەر- وێنە (49)- تەنانەت لەسەربانی ماڵان وەک تەنافی جل هەڵخستن.
هەرچی چۆنێکە دەبێ هێڵ وەک ڕووکاری چەند هێزێک سەیر بکرێ، کە لە چەند پنتێکدا یەکتری دەبڕن، بەگوێرەی وێنەکە و ئەو هێڵانەی بەگۆشەی وەستاو لە سەر یەکتر ستوون دەبن بایەخی خۆیان هەیە، بارێکی مات بوون و سرەوتن پێک دێنن.
بەڵام ئەو هێلانەی کە بەوەدا دەشکێنەوە وەکو بڵێی دژ بە هەر چوارلای وێنەکە وەستاون، وێنەکە دابەشی چەند ڕووبەرێکی لێک لادراو و بەرامبەر یەک دەکەن، هەمیشەش لەناو ڕووبەرێکی پڕبوودا هەستی جوولانەوەمان وەبەر دێنێ.

•

# هێڵی چەماوە

بەرلەوەی بچینە ناوباسەکەوە، دەمانەوێ خوێنەر ئەوە بزانێ کە لێخوردبوونەوە و تێڕامانی سرووشت لەم قسەو باسانە گرنگترن، چونکە ئێمە هێڵی چەماوە لە زۆر شتدا دەبینین کە لە ژیانی رۆژانەماندا تێی هەڵدەنگوین، وەکو گەڵاو گوڵی درەختان- وێنە (53) و (54) کاسە و پەرداخ- و منارە و گومبەزی مزگەوتەکان و ساختمانە ئیسلامییەکان یا نووسین - وێنە (55) چاکتر و بە سوودتریش بوو ئەگەر خوێنەر چاوی خۆی لێ راهێنابوایە و سەرنجی ئەو جیاوازییە ساکارانەی بدابوایە کە لە نێوان چەماوەیی هێڵەکان و گشت شتەکانی دەوروپشتی دان، کە چۆن چەماوەیی هێڵی دەرەوەی مەسینەیەک لەگەڵ هی چادانێکدا جیاوازە، بڕوانە وێنە (56) و (57).

ئەوەی یارمەتی ئەوەشمان دەدا لە هێڵی چەماوە بگەین و هەستی پێ بکەین ئەوەیە: مرۆ قەڵەمێک بەدەستەوە بگرێ و هەوڵبدا چەند هێڵێکی چەماوەی لێکجودا بکێشێ.. یا زنجیرێ، پەتێ، فرێ بداتە سەر رووبەکی سپی و لە کوڕنیشکی چەماوەکانەوە رابمێنێ کە لە ئاکامی ئەو فڕێدانەدا دروست دەبن. وێنە (58) و (59) و (60).



وێنە(55)                هێڵی چەماوە لە (نووسین)دا.



وێنە(56)



وێنە(57)



وێنە(60)

## شێوە چەماوەکان

باشترین نموونەی لێککردنەوەی چەماوەکان ئەوەیە لە سرووشتدا دەیبینین، بۆ نموونە: گردۆلکە لماوییەکان هەروەها ئێسقان و هێلکە شەیتانۆکە.

ئینجا مرۆڤ بۆ پەرەپێدانی روانین و حوکمە خۆکارەکانی خۆی

لەو شتانەی سرووشت وردبێتەوە، باشترە لەوەی پابەندی کۆمەڵێک یاسای دیاریکراو بێ. چەماوەیش لە شێوە بیناسازییەکانی مزگەوت و کلیسە کۆنەکان بەچاکی دەردەکەوێ.
کاتێ ئێمە باسی هێڵ دەکەین. راستان بێ یا چەماوە، هەریەکە و بەتەنیا، مانای ئەوە نییە لێک دابڕاون، چونکە هەریەکیان بایەخ و سیفەتی خۆی هەیە کە وامان لێدەکا بەیەک چاو سەیریان بکەین، بەهای جوانی هەر یەکێکیشیان لەسەر ئەوەکەی تر بنیات نراوە. هێڵە راستە تیژەکان وشکەڵانی و هێز و چۆڵنشینی و دێهاتیەتی وەخۆ هەڵدەگرن. بەڵام کە زۆر دەبن ناسازی و پچڕپچڕی دەگەیەنن.
هێڵی چەماوەیش واتای شیرینی و مێینەتی دەگەیەنێ، بەڵام هێڵی چەماوە کە لە رادەبەدەر نەرم و نۆڵ بێ، ئەوا ئەویش پچڕ پچڕ دەردەکەوێ.
پەرەسەندنی خەتی عەرەبیش بەپێی سەردەم و کۆمەڵگاکانەوە باشترین بەڵگەی ئەمەن، بڕوانە وێنە (61) و (62)، وەک چەند چەماوەیەکی هونەری (بارۆک)[5] و (رکۆکۆ)[6] دەبینین کە لە ئاستی پێویست دەرچوون، سەیر دەکەین وایان لێهاتووە نەخشەکانیان بێ هێزی نواندووە.
بە کورتی جوانی نەخشەکێشان لە پەیوەندی هێڵی راست بە هێڵی چەماوەوە رادەی لێک نزیکیانەوە دێت. بڕوانە وێنە (61). ئەم دوو هێڵە بە جۆرێک پێک دەبەسترێنەوە، وەک پێکەوە بەسترانی هێز و شووشی.
کە هێڵی راستیش هێز بەخۆیەوە دەگرێ، هێڵی چەماوەیش لە پاڵ رێکوپێکی و شووشییەوە، نەرم و نۆڵیشی تێدایە. وێنەش

چەندی لە روو پتر یان چەند رووبەرێکی لە روخسار و مەودادا وێکچووی تێدابێ، نەخشەی وێنەکە بێ هێزتر دێتەبەرچاو، بە پێچەوانەوەش، چەندی رووبەرەکان لێک جیاوازبن، نەخشەکە ئەوەندە دەوڵەمەندتر دەبێ.



وێنە(61)



وێنە(62)

## ئاوازەکانی هێڵ

چاکترین سەرەتا بۆ تێگەیشتنی ئاوازی هێڵ ئەوەیە پنتێک لەبەرچاوی خۆمان بگرین کە دەجوولێتەوەو شوێنەوارێ لە پاش خۆیدا بەجێ دێڵێ، کە لە ئاکامی ئەمەشدا هێڵێک درێژ دەبێتەوە.

ئا ئەم ڕێگایە، باشترین ڕێگایەکە بۆ لێدوانی هێڵی کێشراو، هەر بەمەشەوە نرخێکی بزێو و زیندوو بە نیگارەکە دەدەین، کە هێڵەکە چۆن لار دەبێتەوە و بە توندی تەکان دەدا. چۆن دەشکێتەوە و پاشان ڕاگیر دەبێ تا جارێکی دی تەکان بداتەوە. یا چۆن سووک بە ئەسپایی بەسەر ڕووی کاغەز تێدەپەڕێ. بڕوانە وێنە (63) و (64) و (65) و (66).




وێنە(63)

هێڵیش لەسەر کاغەزدا چەندی جوولانەوەی تێدا زیندوو بێ و ژیانی تیا بێ، ئەوا توانا و هەستیاری و بەهرەی هونەرمەند بەدەردەخا هەر چەندیش هێڵ هەستی بێ تاقەتی و سرەوتن و سارد و سڕیمان وەبەر بێنێ، وەکو بڵێی مردووبێ، هەرگیز ناتوانرێ ببزوێنرێ.
لە ڕاستیشدا بێ ئەوەی بینەر هەستی بێ بکا چاوی لەگەڵ هێڵەکەدا دەگەڕێ و پەیوەندییەکانی دەدۆزێتەوە، بەرزی و نزمی، وەستان و جوولانەوەی، تەکاندان و پنتی ڕاگیربوونی.



وێنە(64) کارێکی هونەرمەند خوان میرۆ



وێنە(65) نموونەی دەسکردی منداڵێ.

کورت و کرمانج چاو دەگەڕێ، ئاواز و بەرزی و نزمییەکانی دەدۆزێتەوە، ئینجا بڕیاری تەبایی و ناتەبایی پەیوەندییەکان دەدا کە داخۆ شتێک دەڵێ یان ئەوەتا لاڵە.



وێنە(66)«ڕەشەبا» دەسکردی هونەرمەندێکی سوریالی.



وێنە(67) هێڵێکی چالاک کە ئازادانە ڕێ دەکات.



وێنە(68) ئەم هێڵەش بە هەمان شێوە دەڕواو و لوول بەدەوری خۆی دا دەخوا.



وێنە(69) هەمان هێڵ، بەڵام لە هێڵێکی دیکە دەئاڵێ.



وێنە(70) دوو هێڵی ناسەرەکی لە تارماییە هێڵێکی چالاکەوە دەئاڵێن.



وێنە(71) هێڵێک کە هەموو سیفەتی وێنەی(74)ی تێدایە، بەڵام لێرەدا هەست بە رووبەریش دەکەین.



وێنە(72) لێرەشدا هەمان هێڵی وێنە (74) بەڵام
بەهۆی فۆرمێکی ترەوە پەیدا دەبێ.



وێنە(73) هێڵێکی چالاک. بەڵام
جوولانەوەکەی بەهۆی ئەو پنتە چەسپاوانە
دیاری کراوە، ئەو پنتانە وەکو پنتی راگیربوونن
بۆی کە جارێکی تر تەکانی تیا بداتەوە.



وێنە(79) هێڵی لوول و بە پێچ هەمیشە هەستی قەبارەمان
وەبەر دێنێ، بەڵام قەبارەیەکی بۆش



وێنە(80) پنتی ڕاگیربوون و تەکاندان،
لەم بارەدا یەکە، سەرەتایش، کۆتاییە.

•

# ئاهەنگ

بەهیچ جۆرێک لە جێی خۆیدا نییە ئێمە چەند یاسایەک بۆ دیاریکردنی (ئاهەنگ)ی هێڵ و تەبایی بەشەکانی دابنێین. چونکە ئاهەنگ لە وێنەدا پابەندی ئاهەنگی هونەرەکانی ترەو بەپێکهاتنی گشتی فسیۆلۆژی و ئەو ئاهەنگە گشتییەوە بەندە کە بە چەشنێکی روون و ئاشکرا لە ژیانی رۆژانەماندا بەرەو روومان دەبێتەوە.

زۆر جاریش بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین یاخود هوردی بکەینەوە، وشەی ئاهەنگ (ئیقاع)مان بەسەر زاردا دێ، بۆ نموونە بە تیپێکی هەڵپەرکێ دەڵێین، تیپەکە رێکیی ئاهەنگ دەپارێزێ، یان گوێ بۆ ئەو ئاهەنگە رێکوپێکە رادەدێرین کە شەمەندەفەرێک بە هەموو خێرابییەکی دەڕوا و پێکی دێنێ.

لە سەمادا سەرنج دەدەین ئەوەی ئاهەنگ رێک دەخا ئەوە دەردەخا کە داخۆ سەماکەران یا سەماکەر لە پێ بزاوتندا ئاهەنگی سەماکە رادەگرن. یان دەنگی تەپڵ و بانجۆکە کە بە تاوتاوی نەگۆڕەوە دێن؟

بەڵام لە شەمەندەفەرەکەدا، لە ئاکامی دووبارەبوونەوەی دەنگی پێچکەکانیەتی کە بە بەر هێڵە ئاسنەکان دەکەون و بە نێو بۆشایی نێوانیانەوە دەگەنە گوێ، جا چونکە ئەو بۆشاییانە نەگۆڕن و لە مەودایشدا یەکسانن، کەواتە ئەوەی ئاهەنگ دیاری دەکا ئەوەیە:
مەودای بۆشاییەکان چەسپاوە و میلە ئاسنەکانیش لە یەک کانن و درێژی بۆشاییەکانیش نەگۆڕە و خێرایی شەمەندەفەرەکەش، وەکی دی لەباری یەکەمدا، ئەوەی کە ئاهەنگ دیاری دەکا بەرهەستیی نەگۆڕی مۆسیقاژەنەکەیە کە بە شوولێک و بەکاتێکی چەسپاو لە تەپڵەکە دەدا و نایگۆڕێ.
لەمەدا دەردەکەوێ (ئاهەنگ) لە ئەنجامی دووبارەبوونەوەی شتێکی دیاریکراو دایە، بە چەشنێکی چەسپاو یاخود نیمچە چەسپاو. هەندێ جار روون و دیارە وەکو مۆسیقای سەما، یا نەخشی قوماش و کاغەزی دیواران، زۆر جاریش وایە لەو دیو پێکهاتەی گشتی کاری هونەری دایە، وەک لە سەمفۆنیادا، یا تابلۆی هونەرمەندێکی نەمر، هەستی پێدەکرێ.

ئاهەنگ لەگەلێک لایەنی چالاکییەکانی مرۆڤدا دەور دەبینێ، وەک وەرزش و گۆرانی گوتنی بە کۆڕاڵ یا تیپی هاژوانی بەلەم، یا رۆیشتنی سەربازان، هەویر شێلانی ئافرەت.
شوفێری ئۆتۆمبێلیش تێکچوونی مەکینەی ئۆتۆمبێلەکەی بەهۆی ناسازی ئاهەنگی ئەو دەنگە هەست پێدەکا کە لە مەکینەکەوە دێ، سەعاتسازیش هەر بەهەمان پێودانگ هەست بە نەسازی سەعات دەکا.

ئاهەنگ لە ژیانیشدا، یەک بەوی دیکە بەستراوەتەوە، بۆ نموونە دەگێڕنەوە دەنگی مەکینەی پاپۆڕێک ئاهەنگی مۆسیقای شیعری (هەواڵە خۆشەکانیان چۆن گەیاند)ی وەبەر (براونینگ)ی شاعیر هێنا.
پێکهاتنی فسیۆلۆژی جوڵانەوەی لەشی ئادەمیزادیش کارێکی زۆر دەکاتە سەرئاهەنگی زۆربەی چالاکییە جۆراوجۆرەکانی، بۆ نموونە: با پێوەری ساتەوەختی هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوە بێنینەوە، زۆر بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێ کە رۆیشتن تەنیا بە کەلێنی قاچمانەوە بەند نییە بەڵکو پابەندی ئەو ماوە کاتییەی



**وێنە(81)**

**ئەوەی ئاهەنگ لەم هێڵەدا دیاری دەکات، ئەوەی پەیوەندیی نێوان بەرزی و نزمیییە، واتا ماوە کاتیەکانن کە هەمیشە ئاهەنگ دیاری دەکەن.**

نێوان هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوەیشە.
کێشی شیعریش وا سازکراوە لەگەڵ هەست و نەستی مرۆڤدا بێتەوە، هەست و نەستی مرۆڤیش بە هەناسەدان و پێوەرە

کاتییەکەیەوە بەندە.
ئاوازەی مـۆسـیـقـاش ((ریزم rythme)  بە درێژی رسـتـە (فـرێزphrase)ـەوە دیاری  دەکـرێ، رسـتـەش بە دەوری خـۆی



وێنە(82) لەم هێڵەدا ئەوەی ئاهەنگ دیاری دەکا،
پەیوەندی نێوان پنتەکانی ڕاگیربوونە.



وێنە(83)



**ئاهەنگێکی ساکار**



**وێنە(84)**

**ئاهەنگێکی ساکارتر**

بەهۆی ماوەی کاتداری هەناسەدان دیاریکراوە.

ئێمە ناتوانین داکۆکی لەوە بکەین کە ئاهەنگ چەند پێوەرێکی دیاریکراوی لە وێنەدا هەیە. بەڵام گومانی تێدا نییە، هەموو ئەمانە چ راستەوخۆ یاخود لابەلا پەیوەندییان بە یەکترییەوە هەیە.

بلیخانۆف[7]، پاش ئەویش لۆڤاڤر[8]، ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە گرنگترین بەهای مرۆڤایەتی لەهەموو کارە هونەرییەکاندا، بە درێژایی مێژووەوە رەگەزی ئاهەنگ و هاوسەنگ بوونە.

ئیزنیشتاینیش [9] لە دوا لێکۆڵینەوەیدا هەوڵی داوە چەند یاسایەکی چەسپاو بۆ ئاهەنگ و هاوسەنگبوون لە چەند کارێکی کلاسیکی نەمر بدۆزێتەوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەرچۆنێ بێ ئەگەر هونەرمەند ئەم تەرزە یاسایانە لە خۆڕا دانەنێ ناگاتە هیچ.

●

# گونجان

ئاهەنگ دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی تەبایی و یەک پارچەیی لە کاری هونەریدا، واتا بەشە جیاجیاکانی پێک دەبەستێتەوە، بەمەیش یەکسانبوون و گونجانی تەواو دابین دەکا.
چەمکی گونجان لەهەموو هونەرێکدا وەکو یەکە. ئەم وتەیە بۆ یەکەم جار لە مۆسیقادا بەکارهێنرا، پاشانیش هونەرەکانی تر خواستیانەوە.
گەلێ کەس لە تێگەیشتنی گونجانی نێو تابلۆ بە هەڵەدا دەچن، چونکە بە نموونە زۆرجار ئەم وتەیە بۆ لێکدانەوەی هارمۆنیای رەنگ یا تەبایی هێڵان بەکار دێنن.
ئێمە لەوانەیە تابلۆیەک ببینین کە هارمۆنیای رەنگ و هێڵی هەبێ، بەڵام سەرنج دەدەین تەواو نییە چونکە لە یاسایەکیەوە کەمە کە بەش و رەگەزەکانی پێکەوە ببەستێ و سنووریان بۆ دابنێ، یاسایەک بیگەیەنێتە چڵەپۆپەی هاوسەنگبوون.
ئێمە بۆ ئەوەی بتوانین چەمکی وشەی هارمۆنی و فەرمانەکانی

لە هونەری شێوەکاریدا دیاری بکەین، ئاسانترە ئەگەر لە پێشدا قسە لەسەر چەمکی هارمۆنی نێو مۆسیقادا بکەین.
ئەگەر هاتو بەچاکی گوێمان بۆ پارچە مۆسیقایەکی ساکار رادێرا، با بلێین سەمایەک بێ، سەرنج دەدەین چەند دەنگێک هەن دەگۆڕێن و رەنگاورەنگ دەبن و لک و چلێیان لێ دەبێتەوە، هەر لەناو ئەو دەنگانەدا هەست بە دەنگێکی نەگۆڕ دەکەین دووبارە دەبێتەوە، دەگونجێ دەنگی تەپلێک بێ، ئەمەش لە باتی ئاهەنگیەتی، بەڵام هەوایەکانی دی ئەگەر نەگۆڕ بن یا گۆڕاو، دیار بن یا نادیار ئەوە ئوکتافن، هەر ئوکتافێکیش لەو ئوکتافانە دەبێ لە ململانێدا تەواو بێ، واتە (قەرار)ێک و (جەواب)ێکی تێدا بێ.
کەواتە ئاهەنگ ئاوازە جیاجیاکانمان، بەرز بێ یا نزم بۆ لێک دەبەستێتەوە، بەم پێیە بەستنەیشی ململانێی بەینی رەنگ و پلەی دەنگە وێکنەچووەکانمان بۆ رێک دەخا.
بەم چەشنە:
ئاهەنگ+ ئەو دەنگە وێک نەچوو و لێک دژانە= هارمۆنی.
(هارمۆنی)یش دەبێ پابەندی یاسایەک بێ کە تەواوی رەگەزەکانی پارچە مۆسیقاکە، لە دەنگی جیاجیاو، ماوەی کاتدارەوە پێک ببەستێ، تا بەو (ریزم)ـە بگەین کە بەردەوامبوونی پارچە مۆسیقاکە رێک بخا و مانایەکی پێ ببەخشێ.
لەم چەند دێڕەدا دەگەینە راستییەکی ئاشکرا و سادە، ئەویش ئەوەیە، هەر کارێکی هونەریی کۆک گونجانێک پێک بهێنێ دەبێ یاسایەک کێشەی نێوان ناکۆکەکانی ناوەوەی رێک بخا.

لە وێنەشدا کێشە لە ئاکامی جیاوازی رووبەرە رەش و سپییەکان و هێڵە ئاسۆیی و ستوونییەکانەوەیە، هەروەها هێڵە ئەستوور و باریکەکان و تۆخ و کاڵ و تیژ و چەماوەکان.

بەبێ ئەم چەشنە یاسایەش، نە ئاوازێ دەمانجوولێنێ، نە لەگەڵ کۆمەڵە هێڵێک دەگونجێین، لە هەمان کاتدا دانانی سنوور و مەودای دیاریکراو بۆ ئەم جۆرە یاسایانە هەڵەیە و لە جێی خۆیدا نییە.

•

# ململانێی نێوان
# پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ

وای لێهاتووە ململانێی شتە ناکۆکەکان بووە بە راستییەک نەک هەر بەتەنیا پێکهاتنی دەروونی و فیسیۆلۆژیمان دەستنیشان دەکا، بەڵکو پێکهاتنی کۆمەڵگا و هونەر و مێژوو و تیۆرە زانستییەکانیشمان دیاری دەکا.

ئێمە ئەگەر وامان دانا رووی کاغەز لای مەند و نێگەتیڤە لەکاری داهێنانی هونەریدا، کەوابێ ئەو هێڵە یا ئەو هێڵانەی دەیانکێشین پۆزەتیڤ دەبن- بڕوانە وێنە (83)- ئەوە لە کاتێکدا وێنەکە لە چەند هێڵێک پێکهاتبێ، بەڵام ئەگەر چەند شێوەیەکی تڵخی بەخۆیەوە گرتبێ- وەکو وێنە (85)- لەم بارەدا هەستی چالاکی رووبەکمان وەبەر دێنێ بەرەو پێشەوە دەچێ- بڕوانە وێنە (86)- ئەو وەختە رووی تڵخی کاغەزەکە پۆزەتیڤە و ئەو هێڵەی سنووریشی بۆ دادەنێ نێگەتیڤە، چونکە بەشێکە لە دیوی نێگەتیڤەکە، بەشێکە لەو بۆشاییەی دەورەی رووبەری داوە.



وێنە(85)



وێنە(86)

هەر شێوەیەکیش لەسەر رووی کاغەزدا بە سێ لای وێنەکەوە دەبەسترێتەوە- وێنە (87).
شێوەی سەر رووی کاغەزیش لە هیچ شتێکی ژیان جیا نابێتەوە. قەوارەیەکە بە دەوری بۆشاییدا (هیوم) یا دەوروبەر کە لە بۆشاییەکەی ڕا دەورەی دەدا و دەبێ بە واقیعی شتەکە، واقیعیەتیش هەمیشە ئەو ململانێیەیە کە لە نێوان شتەکە و دەوروبەریەوە پەیدا بووە.

ڕەگەزی سێیەمینیش (کات)ـە یا مەودای سێیەم- بڕوانە وێنە (87)- دێتە ناویەوە.



وێنە(87)

سەنگی هونەرمەند بەوەیە، بتوانێ نیگارەکانی پابەندی رووبەرەکانی دەوروپشتی بکا، یان بۆشاییەکان بخاتە ژێر ڕکێفی قەبارەکانەوە.
لەوانەیە هونەرمەندێک توانیبێتی، بە خاڵێکی بچووک بۆشاییەکی گەورە داگیر بکا، یا قەبارەی زلی وا لێکردبێ، لە بۆشاییەکیدا ون کردبێ، چی وەهای نەما بێ دەورەی بدا.

# هونەر و سرووشت و خواستی مرۆڤ

ئێمە نامانەوێ بێین ئەوەی لەو چەند لاپەڕەی پێشوودا هێناومانە، بەسەر کاری هونەری بسەپێنین، زۆریشی راڤە لێ ناکەین و لەسەری ناڕۆین، نەبادا خوێنەر وا تێبگا ئەوەی نووسیومانە تیۆری چەسپاو و نەگۆڕن. ئێمە لەوە بەدەر کە خوێنەر بەرەورووی سرووشت و هونەر و مرۆڤ بکەینەوە، هیچ ئامانجێکی دیکەمان نەبووە.

هونەریش هەرچەندی پەرە بسێنێ و پێش بکەوێ، لە روانینی هەمیشە نوێبووەوەی رۆژانەمان دەرناچێ. بەهای کاری هونەریش لەوەوە دێ کە ناکۆکان لە سیستەمێکی دژواردا کۆ دەکاتەوە، هەروەها لە رەخسینی ئەو هاوسەنگ بوونەیشەوە دێ کە بەرەنجامی ئەو هەستە ناسکەیە، ئاکامی دەسکەوتەکانی هونەرمەند و ژانە درێژخایەنەکانی پێشوویەتی.

بۆ نموونە تابلۆکەی جاکسۆن (پۆڵک)[10] وێنە (89)-لەیەک کاتدا رەوانیی ئاوەکەی وێنە (90) و وێکهاتنەوەی تێلدڕەکانی وێنە (91) لە خۆ کۆدەکاتەوە، هەردوو وێنەکە، تێلدڕ و ئاوەکە،

ناتوانرێ بە کـارێکی هونەری تەواو بژمـێـردرێن، چونکە ئەو ئاهەنگە بەجۆش و سەمائامێزەی نییە کە لە تابلۆکەی (پۆڵک) دا هەیە.



وێنە(89)
هونەرمەند
جاکسۆن پۆڵک

ئەو هێـڵانەی مـرۆیەکی سـەردەمـە دێرینەکـانیش لەسـەر دیواری ئەشکەوتێکدا هەڵی کـۆڵیـون -وێنە (92)- بەرادەیەکی زۆر لەگەڵ وێنە (93) دا پێک دەچن، کە ئەتەمی مـاسـوولکەیەکی فـرە گـەورەکـراوی ژێر زەڕەبینە، هێـڵی هەردوو شـێـوەکـانیش دژوارییـەکی بەخـۆوە گـرتووە، بەڵام نیگاری کـابرای ئەشکەوت کـارێکی هونەرییـە، چەندی ئەتەمی مـاسـوولکـەکـەیە کـارێکی هونەری نییە.



**وێنە(92)**

**نیگارێکی دەسکردی ئادەمیزادی دێرین.**



**وێنە(93) ئەتەمی ماسوولکەیەک کە بە میکرۆسکۆپ گەورە کراوە.**

هێڵـەکانی کابرای پێشین ژیانیـان لێ دەچکێ لە ئەنجامی ئەو جـۆش و خـرۆشـەوەیەتی کـە بە بەرد ئاسنێک بە گـژ دیواری ئەشکەوتەکەدا دەچێ. ئەو هێڵانە روونوێنی پۆزەتیڤن بەسەر ئەو دیوارە نیگەتیڤەدا. بەرەڵڵاکردنی وزەیەکی خرۆشاون وەک سەما کردن.

راستەهێڵەکانی پیکاسۆش- وێنە (94)- کە لە چەند پنتێکی راگـیـربووندا یەک دەبڕن، دەرپەڕین و جـوولانەوەی هێڵ دیاری



وێنە(94) دەسکردی هونەرمەند پیکاسۆ

دەکەن، بەڵام ئەوەی ئەو جوانییە بە وێنەکە دەدا ئەو خاڵانەن کە لەو شـوێـنەیان دادەنێ هێـڵـەکـانی تیـا پێک دەگـەن، هەروەها جۆراوجۆری خاڵەکانیش.
وێنەکـەی (پۆل کلێ)یش- وێنە (95) نەرمی و ترازانێکی وای تێدایە، بە چەشنێک چی وای نامێنێ راستەهێڵەکان بشارنەوە.



وێنە(95) دەسکردی هونەرمەند پۆل کلێ.

بەڵام وێنە (96) کە ئەویش هەر هی (پۆڵ کلێ)یە، ئەم وێنەیە هێڵی پێشڤەبڕی سنووورداری لەجوولانەوەدا بەخۆوە گرتووە.
ئاهەنگ لەم وێنەیەدا بەهۆی پنتەکانی راگیربوون و ئەو ناسازییە دروست دەبێ کە لە تێکپەڕینی هێڵە باریک و ئەستوورەکانەوە پەیدا دەبێ.



وێنە(96) کارێکی دیکەی هونەرمەند پۆڵ کلێ.

وێنەکەی تریش بریتییە لە کۆمەڵە هێڵێکی بە پەلە کێشراوی ستوونی و ئاسۆیی خاوو و تێکپەڕیو، ئەم هێڵانە مەودای سێیەم پێک دێنن و هەستی زایەڵەمان وەبەر دێنن.

بەڵام وێنەکەی - کالّدەر- بڕوانە وێنە (97)- پشت بەو بازنانە دەبەستێ کە شل و خاوی زیاد لە پێویستی هێڵەکانی کەم کردۆتەوە، لە هەمان کاتدا لێکچوونێکی تەواویشی پەیدا کردووە، تاکو هەست بە بزاف و خواربوونەوەی هێڵەکان بکەین.



وێنە(97) دەستکردی هونەرمەندی سەنگتراش کالّدەر.

بەڵام ئەو بازنانەی لە وێنەگریکییە کۆنەکەدا دیارن- وێنە (98)، ئەوانیش ئەو کەوانانە پێکەوە دەبەستن کە دەم و چاو و عاردە تلّخەکەی دیاری دەکەن. ئەو بازنانە فەرمانێکی مام

ناوەندی جێبەجێ دەکەن و بە گوێرەی کەوانەکانی پشت گوێیەوە چەشنە لەرینەوەیەک پێک دێنن.
هەروەها پێچە ڕەوانەکانیش کە سنوورێک بۆ دەم و چاوەکە دادەنێن هەر بەو جۆرەن.



وێنە(98) نیگاری سەر کاسەیەکی گریکی.



وێنە(99)

منداڵ هەرکە چاو بە ژیان هەڵدێنێ و دەگریێ... (غەزالی)[11] لای وایە کە:
"چاو شتی بێ پایان نابینێ، بەڵکو سیفەتەکانی تەن دەبینێ، (تەن)یش بە چەشنی دیماهی هاتوویەک دێتە بەرچاو. عەقڵیش دەرک بە زانراوەکان دەکا، زانراویش لەوە ناچێ تەواو ببێ. بەڵێ ئەگەر ئەقڵ سەرنجی زانیارییە لەبن نەهاتووەکانی دا، ئەوا ئەو

بارەی کـە دەیگاتێ بە پایان دەگـا، بەڵام هێـزی بەوە دەشکێ دەرک بە شـتـە لـە بن نەهاتووەکـانیش بکا. لێکدانەوەی ئەمـەش زۆری دەوێ.
ئەگەر نمونەیەکیشت ویست لـە شتە دیارەکانەوە وەری بگرە. ئەقڵ دەرک بە ژمـاران دەکا و بێ پایـانیـشـە، نەک هەر ئەمـەش بەڵکو دەرک بە دووجـــای (دوو) و (سێ) و ئەوانی دیش دەکـــا و بە خەیاڵیشدا نایێ تەواو بێ. هەروەها دەرک بە چەند جۆرە ڕێژەی نێـوان ژمارەکـان دەکاو، لێـرەشدا تەواوبوونی بە خەیاڵدا نایێ، بەڵکو دەزانێ کـــە شت دەزانێ و زانینیـــــشی بە زانـینی زانینەکەیەتی. تواناشی لەمبارەیەوە لەبن نایێ.

*

چاو گەورە بە بچووک دەبینێ، بۆیە خۆر بە ئەندازەی قەڵغانێک و ئەستـێرەکـانیش بە وێنەی چەند لیـرەیەکی پەرش و بڵاوی سـەر تەختەبەڕێکی شین دەبینێ.
ئەقڵیش ئەوە دەزانێ کە خۆر و ئەستێرەکان بە چەند جار لە زەوی گەورەترن. چاو ئەستێرەکان بە وەستاوی دەبینێ، سێبەریش لەنێو دەستـیدا (مت) دەبینێ، مندالّەکەش لەبری خۆیدا مت دەبینێ، هەرچەندە دەزانێ کـە مندالّـەکـە بەرەو پێگەیشتن و بەدەرکـەوتن هەمیشـە لە بزاڤدایە و ئەستێرەکانیش لە چرکەیەکدا چەندان میل دەبزوون.

لە (مشکاة الانوار)ەوە. "



وێنە(100)

زستان درەختان ڕووت دەکاتەوەو تەکاندانی چڵەکانیان بەچاکی دەردەکەوێ
کە بەگژ (بۆشایی) و (کات)دا دەچن



**وێنه(101)**

**« هێڵە گەرم و بەجۆشەکان لە یاخی بوونی سیکۆڕاسدا نابڕێنەوە»**



**وێنە(102)**

**« تەونی جاڵجاڵۆکە»**

# دەروازەیەک بۆ جوولانەوە

ئەگەر جوولانەوە بە بابەتێکی بیرکردنەوە دابندرێ، دەبینین لە نێوان کەمترین و زۆرترین، سادەترین و ئالۆزترین بۆچوونماندا جێوەڕێ دەکا.
نموونە لە وێنەی سادەدا: تێکچوونی سیمای منداڵێ لەکاتی گریان و زەردەخەنەدا، یا وێنەی کەسێ کە باز دەدا، یاخود سەماکەرێک کە سەما دەکا، یا خشۆکێک کە دەخشێ، یا کە تیرێک هەوا دەبڕێ.
نموونەی شێوە ئالۆزەکانیشی: خوولانەوەی ئەستێرەیەک بە دەوری ئەستێرەیەکی دی، یا جوولانەوەی بەشەکانی کرۆنۆمەتر، یا سووڕانەوەی مەکینەی تۆڕبین کە لەکایەیەکی موگناتیسیدا کارەبا پەیدا دەکا، یاخود جوولانەوەی مەکینەکانی رۆکێت، یان جوولانەوەی ئەلکترۆن بە دەوری ناوکدا.
جوولانەوەش سیفەتێک نییە تاپۆی سەر ماددە بێ و بەس. جوولانەوەی واتاییش هەیە، بۆ نموونە جوولانەوەی شانۆیی کە دەمانگەیەنێتە هەڵوێستێکی درامی، بزووتنەوەی رۆشنبیری و هونەر لە کۆچکردن و حاڵیبوون و بڵاوبوونەوەیدا، یا وەک بزووتنەوەی سیاسیی رووت.

بزووتنەوەی ئایدیایش لە ئاسۆی ئەو بابەتانەی بوونیان لە سەرنجدان و حاڵیبوون و بەراورد و شیکردنەوە پڕکردووە، سەری باسانە.
جا چونکە لەوان بابەتانەشە کە بە بیر سپێردراوە بۆیە لایەکی بنچینەیی لە بایەخدانی رۆشنبیر و فەیلەسووف و زانا و هونەرمەندانی گرتووە.

•

## جوولانەوە لە فەلسەفەدا

فەلسەفە وا لە جوولانەوە دەدوێ بەوەی بابەتێکی سەربەخۆیە و قەوارەیەکی میتافیزیکی و فیزیکی هەیە.
فەلسەفە بەم چەشنە لە جوولانەوە دەدوێ و رەگەزەکانی شی دەکاتەوە و لە چەمکەکانی ورد دەبێتەوە.
جوولانەوە- وەک چەمکێکی فەلسەفی- لەسەر ئەوە دەوەستێ کە لە گۆشەی جیاجیاوە شی دەکرێتەوە.
1- لە گۆشەی، جوولانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە پنتێکەوە بۆ پنتێکی دی، وەک جوولانەوەی ئافەریدەکانی سەر رووی ژیان، ئەمەش پێی دەگوترێ جوولانەوەی راگوێستەیی یان راگواستن.

2- له گۆشەی، جوولانەوە لە روانگەی چەند بارو شێوەیەکدا وەک رووەک لە ڕەوگەیەکەوە بۆ یەکێکی دی دەچێ، یا وەک گۆڕانی شێوەکانی کاربۆن لەوەی وەک سووتەمەنی بەکار دەبرێ، یا وەک ماددەی خاوی قەڵەم ڕەش (قەڵەمی رەساس) و یاخود لەشێوەی ئەڵماسدا دەبێ، ئا ئەمەشە چەمکی گۆڕان، یا بەپێی زاراوەی فەلسەفە "سووڕی پلەیی"، لە جۆرەکانی ئەم سووڕەیش، گۆڕانی بەستەڵەک بۆ باری شلی یا گازی یاخود بوون بەهەڵم، یا بە پێچەوانەوە.

3- جوولانەوە لە گۆشەنیگای تێڕوانینی شتاندا، بەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەریاندا دێ تەنیا جوولانەوەی سەر رووی دەرەوەیانە و کار ناکاتە سەر جەوهەریان. ئا ئەمەیە بناغەی بیرکردنەوە لە میتافیزیکیادا، هەر ئەمەشە چەمکی ئەو حەقیقەتە مات بووەی پشت هەموو گۆڕانێک، بۆ نموونە ئەرستۆ وای دادەنێ کە گۆڕان و جوولانەوە لە چەندیەتیدا کە ماددەیە، گۆڕانیشە لە چۆنیەتیدا و پێی دەڵێ "لەناوچوون" دیسان گۆڕان لە بێژەی چەندییەتیشدا، ژمارەیە.

هەرئەمەشە نموونەیەکی سادەی ئەو کۆششە فەلسەفییە دوایی نەهاتووانە بۆ گیردانی رەنگ و شێوەکانی جوولانەوە.

*

لە فەلسەفەی تازەشدا کە بە رێبازێکی فەلسەفی دەگوترێ، رێبازێکی کراوەیە- واتە ئەوەی نەرمی و جوولانەوەی تێدایە،

ئەگەر هاتو لەسەر بناغەی بیرکردنەوەیەکی بەرنامەییەوە لە شتان خورد بێتەوە. کە ئەوەشی بەسەردا بشکێتەوە، بیرێکی چەسپاوو دوابڕاوە، پێی دەگوترێ رێبازێکی داخراو. کە لە دوایشدا لەکار دەکەوێ و بەرە بەرە سات لە دوای سات تا هەرەس دێنێ.

•

## جوولانەوە لە زانستدا

ئەمە باسێکی بنەڕەتی و زیندووە، دەشتوانین بڵێین سەرەباسی زانست، بریتییە لە لێکۆڵینەوەی شێوەکانی جوولانەوە و یاسای بەرزی و نزمییەکانی.
بۆ نموونە زانستی فیزیک لە جوولانەوەی ئەلکترۆن دەدوێ کە بە دەوری ناوکدا دەخولێتەوە. یا لە خولگەیەک بۆ خولگەیەکی تر دەچێ.
دیسان ئەوەی لە فیزیکی شەپۆڵداردا دەبینین لێکۆڵینەوەی جۆرە جوولانەوەیەکە، واتە لەرینەوەی شەپۆلەکان جا چ لە شێوەی وزەی رووناکی یا دەنگ یا گەرمی یان کارەبایی بێت.

چەندی زانستی میکانیزمی ستاتیکییە، لەبارێکی تیۆری گریمانکاریدا دەکۆڵێتەوە کە لە خەیاڵدا نەبێت نییە، ئەویش باری راگیربوون و نەبزووتنی تەنەکانە.
تەماشا دەکەین تێرمۆدینامیکاش تایبەتییە بە گواستنەوەی، یاخود جوولاندنەوەی گەرمایی لە تەنێکەوە بۆ تەنێکی تر، یا لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی دیکەی جیاواز.
لەسەرجەمی ئەنجامەکانی زانستیشدا بیری هاوچەرخ چەمکێکی تەواو و خڕگرەوە بۆ جیهان بنیات دەنێ بەوەی جوولانەوەیەکی بەردەوام و ئەزەلییە.
بۆیە دێمانەی نیوتن لە لێکدانەوەی جوولانەوەی گەردووندا جێی خۆی بۆ دێمانەی رێژەداری (ئەنیشتاین)[12] چۆڵ کرد، پاشان ئەنیشتاین هەوڵی دا بەرەو لێکدانەوەیەکی فراوانتر و دووررۆتر لە پەیوەندییە تایبەتی و گشتییەکاندا هەنگاو بنێ، ئینجا هات دێمانەی (بواری یەکخراوی) خستە روو. بەم جۆرە مەسەلەکانی بیری هاوچەرخ دەربارەی جوولانەوە، مەسەلەی دوابڕاو نین و هەرگیز لێکۆڵینەوەیان لەسەردا تەواو نابێت.
لەوانەیە ئەو مەسەلانەی لە هەموو مەسەلان زیاتر بیرمان دەورووژێنن، جوولانەوەی بیری مرۆڤایەتی خۆیەتی، کە لە روانگەیەک یاخود فەلسەفەیەکەوە هەڵدەقولێ، تا دەگاتە ئەوەی دیاردەیەکی سرووشتی دەردەخا، پاشان دێ تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئەو دیاردەیە دەور دەکاتەوە.
تێگەیشتنی مەسەلەکەیش لەسەر ئەوە ناوەستێ کە دەورەیەکی کورت و سادەیە چونکە ئەم جۆرە دەورانە لەنێو جوولانەوەی کێشە و ململانێدا نەبێ تەواو نابن.

نموونەی ئەمـەش دیاردەی (هێزنبێرگ)ـە لە فیزیکی نوێدا، ئەو دیاردەیەی جیاوازی بنچینەیی پێک هێنا و ئەو ئەنجامانەی لێ سەنگرایەوە کە بە دەوری حەقیقەتی زانیاری و لێکدانەوەی زانست لە مادده و جوولانەوەدا دەخولێنەوە.

هێزنبێرگ ئەوەی دۆزیەوە کە: "ئەگەر خێرایی ئەلکترۆن بە وردی بپێورێ، ئەوە مەحاڵە بتوانین بە هەمان پێودانگ بارستەکەشی بپێوین، پێچەوانەشی هەر راستە".

ئەو کاتە زانا و فەیلەسووفەکان بوون بە دوو بەشی لێکدژ:

1- هەندێکیان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە مەحاڵە زانیاری و متمانە و باوەڕپێکراو هەبێت، مادەم زانست لە هەموو زانیارییەکانی دی وردترە و بە هەڵوێستێکی دەستەوەستان لە دیاریکردنێکی ورددا.

2- ئەوانی دی گەیشتنە ئەو ئەنجامەی هەڵوێستێکی گەشبینتر وەربگرن، بەوەی زانیاری متمانەپێکراو مەحاڵ نییە ئەگەر نەڵێین هەنگاوێکی نوێی بەرەو وردبینی هاویشتووە، بۆیە بۆ ئەوە چوون کە مانای دیاردەی هێزنبێرگ ئەوەیە، زانست وای لێهاتووە، توانای ئەوەی هەیە لە نزیکترین و وردترین پێوەر بۆ لادانی نێو چەماوەی جوولانەوە و پەرتبوونی ڕێڕەوەکانی بگات.

•

# جووڵانەوە و کۆمەڵ

کـێشـە زانسـتـیـیـەکـان هەمـوو بیـرکـردنەوەی مـرۆڤـایەتی لە جـووڵانەوەدا ناگـرنەوە، بەڵکو ئەو بیرکـردنەوانە لـە گـیـروگـرفـتـە کۆمەڵایەتی و مەسەلە ئایدیۆلۆژییەکانیش رەنگ دەدەنەوە.

لە هەمـوو ئایدیۆلۆژیایەکـیش زێـتـر جێی مـشـتـومـڕ بێ، تیـۆری ماتریالیزمە، کە بنەمای ئەم فەلسەفەیەش جووڵانەوەیە، چونکە یاساکانی کـێشـە و دیالێکتیـک لە بنەڕەتدا، چەند سیـفـەتێکی جووڵانەوەیی ناوخۆیەتی.

مـەسـەلەکـە لە قـسـەیەکی کـۆنی (هێـراکلیـتـس)[13] ەوە دەست پێـدەکـا: "هەمـوو شـتـێک لە گـۆڕانێکی بەردەوام دایە، تۆ دوو جاران ناچیتە نێو رووبارێکەوە، چونکە بەردەوام ئاوی دەچێتەوە سەر."

رێبـازی مـاتریالیـزمـیش، کـۆمـەڵێک یاسـا و چەمکە، ئەوە لێکدەداتەوە کـە چۆن جـیـهـان لـە جـووڵانەوە دانابڕێ، بەم جـۆرە جیهان لە گۆڕانێکی بەردەوام دایە.

بیری ماتریالیزمی بۆ ئەوەش دەچێ کە دیالێکتیک وەک رێبازی بیـرکـردنەوە- تەنیـا رێبـازێکە بـتـوانێ بەڕاسـتی لە جـووڵانەوە بکۆڵێتەوە.

ئەمەش نەدەبوو ئەگەر ژێربێژییەکی رەمەکی تێدا بەکارهاتبوایە چونکە وای دادەنا هەتا هەتایێ حوکمەکان بەچەسپاوی دەمێننەوە تاکو بەرەنجامەکەی راست دەربچێ.

لەکۆمەڵیشدا وەکو لە سرووشتیش هەروایە، جوولانەوە سەری باسەکانە، ماددەش جوولانەوەی لەنێو دایە، زانستەکانی سرووشتیش بەبێ تێگەیشتنی ئەو جوولانەوەیە ناتوانن لێی بکۆڵنەوە.

کۆمەڵیش لە بواری جوولانەوەدا نەبێ، نە دەتوانین تێی بگەین نە ئەوەش دەچێتە خەیاڵ، کۆمەڵگایەکی وەستاو هەیە ، تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە تا رادەیەکی زۆر خاون، ئەگەر بە وردی سەیر بکرێ بەڵگە و دیمەنی هەمەجۆری لە گۆڕان و جوولانەوە تێدا دەبینرێ، بۆ نموونە گوێزرانەوەی کەلتوور و داب و نەریتەکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی و ئەو گۆڕانکارییانەی بە دوایاندا دێن و ئەوانەی دەخرێنە سەری.

●

# جوولانەوە و کات

دەتوانین بڵێین جوولانەوە بە گوێرەی کات دوو رووکاری هەیە: رووکاری یەکەم: جوولانەوە بەوەی بریتییە لە گێڕانەوەی کاتی رابوردوو یا کاتی ونبوو، واتە گرتنی جوولانەوە لە رابوردوویدا، ئا ئەمەشە کاری هەردوو زانست؛ مێژوو و ئارکیۆلۆژی.
رووکاری دووەم: تێڕامانی کاتی ئایندەیە، واتە هەوڵدان بۆ دەست بەسەراگرتنی جوولانەوە لە ئایندەدا، ئەو زانستانەی بایەخ بەم رووکارە دەدەن، زانستی سیاسەت و نەخشەدانانن، بەڵام لێرەدا کات بەمانا عادەتییە باوەکەی دەمێنێتەوە کە لە هاتنی شەو و رۆژ و دابەشبوونیان بۆ بیست و چوار سەعاتەوە هاتووە.
رۆژگاری ئاساییش لە جوولانەوەی (شوێن)ـەوە بەدەر چیتر نییە، هەر ئەستێرەیەکی گەردوونیش کاتێکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوەتا زەوی بە دەوری خۆی لەبەر خۆردا دەورەیەک دەخولێتەوە، کە ئەمەش رۆژە، خۆ ئەگەر زەوی نەجوولابوایەوە هەستمان بە وەرچەرخان نەدەکرد و مانای (کات)یش پەیدا نەدەبوو.
سەرەڕای ئەوەش، کات مانایەکی دەروونیشی هەیە. کاتی دەروونی بە کاتی رێژەییەوە بەندە و بە خێرایی جوولانەوەی شت و بیرکردنەوە و یادگار و بەرزی و نزمیانەوە پێوانە دەکرێ، بە جۆرێک هەست بەکاتکردن و تێپەڕبوونی بەپێی جیاوازی هەلومەرج و رادەی پێخۆشبوون و تێگەیشتنی مەرجەکانییەوە دەگۆڕێت.
نموونەی باوی ئەوەش ئەو جیاوازییەیە لە هەست بە کاتکردندا، کاتێ لەگەڵ دەستگیرانەکەتدا دانیشتووی یاخود لەبەردەم

موحەقیقێکدا. بە تەبیعەتی حاڵیش رەگەزی ئاڵۆز و گرێچن دێنە ناو کاتی دەروونییەوە، کە هەروا بەو سادەییە تێی ناگەین. چونکە (کات)ی دەروونی پێکهاتەیەکی خودییە و لەسەر ئاهەنگی تاکەکەسەوە وەستاوە کە کاری دەوروبەر و تاقیکردنەوەی هەمەجۆر و بیرەوەری و رادەی بەرەوپێشچوونی گەشەسەندنی هۆشیاری دێنە سەر و بەرە بەرە لە پێکهاتوویەکی ساکارەوە بەرەو پێکهاتەیەکی ئاوێتە دەچێ.

(کاتی دەروونی)یش یاسای رادەی ئەوپەڕی یاسای، سرووشتی (یا ئاسایی) بەسەر دەسەپێ. لە وەختی ئاساییدا کات بە گۆڕانی خێرایی، جوولانەوە دەگۆڕێ. رادەی ئەوپەڕیشی ئەوەیە بگاتە رادەی خێرایی رووناهی، کە ئەمەش ئەوەندەی ئێمە بیزانین -مەحاڵە- بەوەش لێی رەت دەکا. کاتێ جوولانەوەی هەر تەنێک، یاهەر شتێک دەگاتە خێرایی رووناهی دەرحاڵ دەبێتە رووناکییەکی رووت.

لەکاتی دەروونیشدا، هەندێ رادەی دیاریکراو هەیە، کارتێکردنی تیا روونادا وەکو ئێمە بۆی دەچین، بۆ نموونە توندی دەنگ لە لەرینەوەیەکی دیاریکراوەوە زیاتر بێ، لە بواری بیستن دەچێتە دەرەوە. تێنی ئێشیش، گێلی لێ پەیدا دەبێ و لە هەستپێکردن دای دەبڕێ، یا ئادەمزاد لە باری هۆش دروستیدا دەباتە دەرەوە.

کات لای کەسێکی داماو یا کەسێ کە دووچاری وەڕسبوون دەبێ جیایە لەگەڵ کاتی ئەو کەسەی خەریکی چالاکی و رابواردنی خۆیەتی.

ئەم جیاوازییە چلۆنایەتییە لەکاتی دەروونی هونەرمەندیشەوە

نزیکه، به جۆرێک ئەو بارە خودییەی لەسەر ئاکاری خۆیدا وەستاوە، دەبێ بەهۆی گۆڕینی ئاهەنگە هونەرییەکە. ئەو پێکهاتە یا ئەو کونجوکاوییە دەبێ بە چەشنە داهێنانێک، کات و شوێن لە یەک کاتدا دەداتە بەرێ!
بەم جۆرە هونەرمەند دەبێ بە بەشێک لە قەوارەی نەمر و هەمیشە لە برەوی مێژوو. لەم داهێنانەشدا کات سیفەتی شوێن و شوێنیش سیفەتی کات وەردەگرێ.

●

## جووڵانەوە لە هونەردا

مرۆڤ جووڵانەوە ئامێرییەکان دادەهێنێ و دروستی دەکا و دەستیشی بەسەردادەگرێ و بۆ سوودی خۆی ژێردەستیان دەکا. ئەمەش لەگەڵ جووڵانەوەی ناو ئەستێرەکاندا جیاوازە، ئەم جووڵانەوەیە، جووڵانەوەیەکی مەڵبەندیی راونەرە و ئاهەنگی تایبەت بەخۆی هەیە و لە یەکیەتیەکی ئاهەنگاویدا پابەندی ئەستێرەی دیکەیە و ئادەمیزاد دەستی بەسەردا ناشکێن، لەگەڵ ئەوەشدا لە ژێر رکێفیەوەیەو بە هەموو توانایشیەوە هەوڵ دەدا خۆی لە یاساکانیەوە رزگار بکا، هیچ رێگایەکیش بۆ ئەو

مەبەستە نییە، تێگەیشتنی نەبێ، پاشانیش بەکارخستنی تێگەیشتنەکەی.
لە جوولانەوە هەمەجۆرەکانی ژیانیش، تەریب بوون و پەیوەستن و چوونەوە پاڵ یەک و هاوکێشە هەن، واتە بە کورت کردنەوە ئاهەنگ و یاساکان چۆنییەتی نزیکیشیان لە نێوان خۆیان و چەمک و مانای جوولانەوەی نێو هونەر لێرەدایە.
هاوسەنگبوونی تەواویش کە بارێکە لە گونجان و هاوکێشە بوون کە ئەویش بارێکی لەنگەرگرتنەو لەسەر جوولانەوەیەکی بەردەوامدا، لە ئەنجامی لێکدانی ناکۆکەکان و هاوکێشەبوونی رووکارەکانییەوە بنیات نراوە.
ئەم چەشنە هاوسەنگبوون و گونجانەش لە تواناداا نییە لە جیهانێکی ماددی هەمیشە لەبرەودا بێتە دەست.
ئەم گونجانە بۆی هەیە لە کاری هونەریدا بەدەست بێ چونکە کاری هونەری هاوسەنگ بوونێکی کات برە، داهێنانێکی رەخساوەو جوولانەوەی بێ پایانی ژیانی تێدایە.
کەواتە جوولانەوە لەکاری هونەریدا پابەندی یاسایەکی چەسپاوە، یاسایەکە بە یاساکانی ژیانەوە بەندە، هەموو هونەرمەندێکی رەسەن و داهێنەر دەتوانێ ئەم یاسایە بدۆزێتەوە و دایبڕێژێ و دەری بخا.
کە هونەرمەندیش بیرۆکەیەکی دەبێ و دەسەڵاتی بەسەردا دەشکێ، لەمەشدا بە دەوری خۆی بەهۆی دانانی لە چوارچێوەی یاسایەکەوە دەستی بەسەردا دەگرێ، ئیتر چی وەهای پێ ناچێ بەرهەمێک دەنووسێتەوە یا تابلۆیەکی گەورە دروست دەکا یا سەمفۆنیایەک..

ئەم جۆرە کارە هونەریانە کە لە پێکهاتنیاندا ئاڵۆزن زۆر نابا دەبن بە رووی لێکدانەوەی یاخستنەڕووی ئەو بیرۆکەیە، یا ئەو یاسایە. کارەکانیش هەندەی نابا هەر لە خۆیاندا دەبن بە خوایشتێک لە لایەن هونەرمەندەوە بەهۆی ئەو بیرۆکەیە یا ئەو یاسایەی تێیدایە، جا لەگەڵ ئەوەی دارشتنی کارە هونەرییەکە ئەوەی بۆ دەردەخا کە بە سەریدا زاڵە. بەڵام هەمیشە لەبەردەم هێزی ئەو یاسا بێ پایانانەوە هەست بە بێ دەسەڵاتی خۆی دەکا. کەواتە بڵێی بۆمان هەبێ بڵێین مێژووی مرۆڤ کە بە مێژووی ئایدیا و هونەر دیاریکراوە- لە مێژووی حەقیقەتی موتڵەق بەدەر نییە- ئەم قسەیەش لە قسەکەی (ئاندرێ ژید)[14] نزیک دەبێتەوە کە دەڵێ: "مێژووی ئادەمیزاد، مێژووی حەقیقەتە موتڵەقەکانە."

•

# سایکۆلۆژیەتی جوولانەوە

* جـوولانـەوە ژیان دێـنێـتـە کـایێ و دەریشی دەبڕێ، هەروەها بەردەوام بوونیشە بۆی.
* جوولانەوە خۆی نوێ دەکاتەوە و لە نوێیشەوە دەست پێدەکا.
* جوولانەوە خۆی لە سەرچاوەیەکەوە هەڵدێنجێ، هەندێ جاریش خۆی و سەرچاوەکە دەبنەوەیەک.
* جوولانەوە شتێکە دەبزوێ تا دیماهی نەهاتن وەکو ئاسمان.
* جوولانەوە دەم دەمییە، دەکوژێتەوەو لە کار دەکەوێ و دەمرێ تا سەرلەنوێ لە شێوەیەکی دیکەدا پەیدا ببێتەوە.
* لێـچـوونەوەی جـوولانـەوە یانی لێـچـوونەوەی هێـزە بەیەکداچووەکان.
* جوولانەوە لە پێشڤەبڕەوە بۆ پاشڤەبڕ: لە کارکەوتن و مردنە، بەڵام لە پاشڤەبڕەوە بۆ پێشڤەبڕ: بەردەوامی ژیانە.
* کە بە خێرایی سەرنج لە کاری هونەری بدەین، هیچ مانایەک نابەخشێ، پێویستە لەگەڵیدا بژین و هەست بەو جوولانەوەیە بکەین کە بە خۆیەوەی گرتووە، هەست بە شێوە و بێگەردییەکەی

بکەین، چونکە لە هەمان کاتدا هەم سەربەخۆ و هەم ڕێکخراویشە.

* لەکاری هونەریدا جەمسەرەکانی جوولانەوە لەسەر بۆچوونی نێو بۆشاییدا وەستاوە، هونەریش لە چەرخی بووژانەوەدا لەسەر ئەم پێوەرە وەستابوو، تا ئەوەی (سیزان) تێکی شکاند و (براک)یش لە بەینی برد، چونکە ئەوە وادەگەیەنێ نە بارستە و نە شوێن و کات، تەنانەت بۆشاییش لە خودی خۆیدا هیچیان نین.

لەوانەیە ئەنجامە ڕێژەیی و بۆچوونە بیرکارییە فەلسەفییەکان لە تێگەیشتنی راستگۆیانەی شوێن و جوولانەوەدا لەگەڵ تیۆری سیزان و براکدا یەک بگرنەوە، چونکە (لێچوونەوەی جوولانەوە) و بوونی سفر، بوونێکی خەیاڵییە، کێشەی ئەو سفرە تاکو ئێستا ساغ نەکراوەتەوە کە داخۆ بەڕاستی هەیە یان هەر خەیاڵە و هیچی تر. چونکە لە سفردا تەواوی بەهاکان یەکسان دەبن و هەروەها جوولانەوەش لە سفردا چەسپاو دەبێ.

کێشەی (یەک)یش هەر بەو جۆرە ماوەتەوە و سەرەتای خولّقاندن (یەک)ـە، لە (یەک)یشدا جوولانەوە هاوسەنگ و چەسپاو دەبێ، ئەو (یەک)ـە لەگەڵ بۆشاییشدا بەرەو دوایی نەهاتن یەک دەگرنەوە ئا بەم چەشنە بۆشایی دەبێ بە گرفتێک و دووچاری هونەرمەند دەبێ، ئەویش بەهۆی پەیداکردنی جوولانەوە لەسەر ڕوویەکی وەستاو یا بارستەیەکی سەقامگرتوو، بەرەنگاری ئەو ترس و سام و لەناخەوە هەست بە بۆشایی کردن دەبێتەوە تاکو ژیانی پێ بدا.

گیروگرفتی ئەو یەکە بە ئاشکرایش لە هونەری (تەواشیح) –

ئارابێسک-دا یەکلا دەبێتەوە بۆ نموونە لە نەخش و نیگار و مۆسیقای عارەبیش دەرهاوردەکان تا دیماهی نەهاتن دەڕۆن، دەڵێی ژمارە (یەک)چەند جارە دەبێتەوە تا بۆشایی پڕ بکاتەوە، بەم چەشنە دەبینین ئەم هونەرە دەنگ و رەنگدانەوەی بیری سۆفیایەتییە لە نێو موسڵمانان‌دا، چونکە لە نێو سۆفییە موسڵمانەکان‌دا کێشەی ئەو (یەک)ـە هێشتا هەر ماوە و، دەق وەکو کێشەی (سفرە)کەی نێو ماتماتیکستەکانە.

* هونەر لەسەر قووڵایی و رووناکیدا دەوەستێ، ئەم دوو بنەمایەش جوولانەوە لێک دەدەنەوە، لە کاری هونەریشدا جوولانەوە نە تەواو دەبێ نە دەبڕێتەوە. بەڵکو هەمیشە خۆی نوێ دەکاتەوە و لە ئاهەنگێکی جۆراوجۆری بێ سنوور پێدا دێتەوە، بنەتایش هەمیشە دەبێتە سەرەتا.

* هەر نەخشەیەکی بگری پشت بە جوولانەوە و کارکردەیی و ململانێوە دەبەستێ.

* جوولانەوە یاریدەی هەست بە بارستەکردن دەدا.

* جوولانەوە یا رووبەک دەسمێ یاخود لە باڵ یەکی دەردێنێ.

* جوولانەوە شێوە بنیات دەنێ.

* دەشێ جوولانەوە لە ئەنجامی کێشەی چەند نەسازاوێک بێ، وەک ململانێی لەش لەگەڵ بۆشایی دەوروپشتیدا.

هەندێ جار کە لەش هۆیەکی خۆگر (ایجابی) دەبێ بۆشای دەخاتە ژێر رکێفی خۆی کە لای دارن-سلبی- دەگرێتەوە. هەندێ جاریش بە پێچەوانەوە دەبێ، ئەوا بەبۆشایی خۆگرەوە دەخنکێ.

* ناکرێ جوولانەوە بێ ئاهەنگ بێ، دەبێ ئاهەنگێکی دیاریکراوی هەبێ.

جا چونکە جوولانەوە - لە خۆیدا- دیماهی نییە، زەینون ئایلی گوتوویەتی: "شتی بزواو ناکرێ نە لە شوێنی خۆی و نە لە شوێنێکی دیکەوە بجوولێتەوە".
کەواتە جوولانەوە، بارێکی خۆگرە، سەرکەوتنە، ئەمەش لە خۆیدا ئامانجە.

●



**وێنە(103) گوێ شەیتانۆکەییێک بە تەکاندانیەوە جوولانەوە دەردەبڕێ.**



**وێنە(104)**
**گوێ شەتانۆکەیەکی دی بەڵام**
**لەجوولانەوەیەکی لوولەییدا.**



وێنە(105)
هەوڵی بێ هودەی چەند
دڵۆپە مەرەکەبێک پێش
توانەوەیان لە ناو ئاودا.



وێنە(106 ) پێکهاتەیەک کە لە دوکەڵێکی خەست بووەوەدا دروست بووە.



**گوڵێک**



**گوڵێکی دیکە**



**وێنه(107) سەماکەرێکی بالێ.**

وێنه(108)
ماسییەک



وێنه(108)
ماسییەک

# بزاڤی پەرەسەندن
# لە زانست و هونەر و ژیاندا

«وای لێهاتووە هونەرمەند و زانا یەک پێویستی بەوەکەی ترە، ئەمەش پێویستییەکە دەستی لێ بەرنادرێ.»

ئێستاشی لە گەڵدا بێ کێشەی بەینی (داروین)[15] و (لامارک)[16] هەروا ماوەتەوە.

ئایا سرووشت لە هەموو رووکار و گشت شێوەیەک نەشونمای دەکرد؟ پەرەی دەسەند و هەربەخۆشی خۆی قاڵ دەکرد تا بەم شێوەی ئێستای گەیشت؟

کە ئێستاش ئەوەتا رێگای پەرەسەندنی گرتووە؟

ئا ئەمە بوو کە داروین لەسەری سوور بوو.

چەندی لامارک بوو پێشنیهادی ئەوەی دەکرد، کە کرداری پێکهاتن هەر لەسەرەتاوە پابەندی چەند یاسایەکی نەگۆڕ بووەو بەرێگایەکی زاندراو و دیاریکراویشەوەدا دەڕوا کە هەر لە پێشەوە بۆی کێشراوە.

بۆنموونە، ئادەمیزاد -ئێستا- پێنج پەنجەی بەدەستەوەیە، ئەمەش بە تەبیعەتی حاڵ پێویستییەکی فیسیۆلۆژییە. هەر ئەنگوستێک فەرمانێک بەجێ دێنێ بۆ یارمەتیدانی فەرمانی دەست، هەر پێنج پەنجە پێکەوە فەرمانی دەست بەجێ دێنن، دەستیش دەگرێ و

رادەکێشێ و دەگوشێ و هەڵیش دەگرێ و...تاد.
داخۆ سرووشت ئەوەی دەزانی کە ئادەمزاد تەنیا پێویستی بە پێنج ئەنگوستانە؟ ئیتر لەمەوە دەستی پێکرد دەستی پێنج پەنجەیی بۆ پێک هێنا و بەردەوام ئەو دەست و پەنجانەی مشت و ماڵ و لووس و لێک کرد، تا وای لێهات ئەو رێژە گونجاوە و ئەم بارە نەرم و شیاوە وەربگرێ بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی.
ئەمەیان دانراوێک، دانراوێکی دیکە ئەوەیە: کە سرووشت لە ناچاری ژمارەیەک پەنجەی پێک هێنا پاشان مەرجە چەسپاوەکانی پەرەسەندن هات و هەرچی دەست پێویستی پێی نەبوو رەتکرایەوە و ئەوەی پێویست بوو زیادکرا تا وای لێهات دەست پێنج پەنجەی بوو.
ئا ئەم کێشەیە هێشتا هەر ماوە.

دیسان هەتا ئێستاش دەربارەی نهێنی پێکهاتنی هونەرییەوە لەسەر وەڵامێکی پڕ بە پێست لەنگەر نەگیراوە:
- ئایا هونەرمەند لە توانایدا هەیە ئامانجی خۆی دەستنیشان بکا؟ ئایا دەتوانێ هەر لەسەرەتاوە رێگایەکی روون ودیار بۆخۆی بکێشێ؟ یا مرۆڤێکە بە دوای هەڵچوون و خرۆشەکانی خۆی دەکەوێ و چۆنی ویست گورِ بە خۆی دەدا و تەماتیکی دەری دەبڕێ؟ تاکو سەرەداوێک دەگرێ و بیرە پەرش و بڵاوەکانی کۆ دەکاتەوە و پێکیان دێنێ، ئینجا دەست بە مشت وماڵی فۆرمەکانی دەکا و رەگەزەکانی کارەکەی دەخوڵقێنێ.
جا چ ئەم رێگا یا ئەو رێگا، رێگای راستەقینەی هونەرمەند بێ، ناتوانین کارە تەماتیکییەکە لەبەرهەمی هونەرمەند دوور

بکەینەوە و دانی پێدا نەنێین.

تەماتیکییەتیش سیفەتە نەک ئەنجام یاخود ئامانج، وەکو هەندێ کەس بۆی دەچن، تەماتیکییەت نیشانەیەکە سەرگەرمی و نوێ بوونەوەیەک بە کاری هونەری دەدا و دێمێکی جوان و کۆکی لێ دەردەکا.

دوو فەیلەسوف کۆڵەگەی تەماتیکیەتی جوولانەوە بوون، (هێنری بێرگسۆن)«[17]» و (چارلز بیرس)«[18]»، هەڵەی (بێرس)یش ئەوەبوو کە نەیتوانی تەماتیکییەت و رێکەوت لێک بکاتەوە، وەک (بێرگسۆن)یش نەیتوانی تەماتیکیەت و کاری داهێنان لە تەواوکاری و کۆکیدا پێک ببەسێتەوە.

بەم جۆرە هەڵوێستەکە وا کەوتەوە کە ئێستاش وەک پرسیارێکی ئاراستەکراو ماوەتەوە و وەڵامێکی پڕ بەخۆی بۆ نەڕەخساوە.

فەلسەفە چارەی تەنگ و چەڵەمەکانی ئادەمیزادی نەکردووە، لەوانەیە ئەمەش ئیشی فەلسەفە نەبووبێ، فەلسەفە بە تەنیا پرسیاری قووڵ یا سەیر دێنێتە گۆڕێ، بۆیە زۆربەی زانایەکان سوورن لەسەر ئەوەی زانست جێگای فەلسەفەی گرتووەتەوە:

زانستیش بەدەوری خۆی گیروگرفتەکانی مرۆڤی چارەسەر نەکردووە، دەگونجێ ئەو رێگایەی گرتبێتە بەر- چەندی زیاتریش بەرەو پێش بچێ، گیروگرفتەکانی مرۆڤیش نوێ دەبنەوە و

نەسرەوتنیشی هەمیشەییە و رووەو سەرکەوتنی زیاتر پاڵی پێوە دەنێ، رێبازی هونەرمەندیش لە بەرامبەر ئەم کێشەیەدا تەم و مژاوی دەبێ.
داخوا ئاوێنەیەکە سەردەمی ئێستای عەکس دەکاتەوە؟ یان مژدەی ئایندەی پێیە؟ ئایا شایەدی سەردەمەکەیەتی، یان لێی تێپەڕیوە؟ ئایا  هونەر رەنگدانەوەی سرووشتە؟ یان ئافریدەیەکی تەواو جیاوازە لێی و شتی دەخاتە سەر، یانەخۆ سەرلەنوێ پێکی دێنێتەوە؟ هەر پرسیارە و دێ...

ناشکرێ هیچ جوولانەوەیەک بوەستێنرێ، لە مردندا ژیان پەیدا دەبێ و لە تاریکیشەوە رووناکی هەڵدەقوڵێ، (گاز)یش لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی بەهێزدا چار نییە دەبێ بۆخۆی بەدوای کەلێنێکدا بگەڕێ. ئێمە لەسەردەمی ترس داین، ژانەکانمان بۆ زاڵبوونە بەسەر ئەو ترسەدا، ئەمەش نابێ بەبێ تێگەیشتنی راست و دروستی گشت دیاردە سرووشتییەکانی دەوروبەرمان و پرسیاری زۆری بێ وەڵام.

تەکنەلۆژیا بێنی فەلسەفەی تەنگ کردووە، هونەریش ئەمڕۆکە پتر لە پێشوو بە زانستەوە بەستراوەتەوە.

بڕوا بەخۆبوونی ئێمەی هونەرمەندیش لە رێی روانینی قووڵی راستی شتەکانەوە دێ. چونکە روانینی تەماتیکی کە تا چاخەکانی نێوەڕاست لەنێو پیشەوەرە بەهرەدارەکاندا بوو ئێستاکە نەماوە.

ئەمڕۆ لە (تیشکی X) دا گوڵ بە وێنەی رووپۆشێکی ئەفسانەیی ئایینی بەدەر دەکەوێ.
بەهۆی میکرۆسکۆب و تەلسکۆب و ئامێری ئالۆزی دیکەی ئەلکترۆنییەوە، نەک هەر تەنیا ئاسمانی بەرفرە دەبینین و دەچینە نێو دەریایە بێ بنەکانەوە، بەڵکو لە تواناییشماندایە نێو بەرد و ناخی زەوی و ژێر پێستی خۆبشمان ببینین چی تێدایە. وای لێهاتووە دەتوانین بەهۆی ئامێرە وردەکانەوە فڕۆکەی لەدەنگ خێراتر و فڕیو (لە وێنەدا) رابگرین و وێنەی یەکەمین تروسکایی مۆمێک یا بڵێسەیێ بگرین.
ئەمڕۆ لە تواناداییە وێنەی (هەوا)مان دەست بکەوێ کە لە بۆشاییەکدا بەرەڵڵا دەکرێ، یا جوولانەوەی ئاو لە بن رووبارێکی رەواندا.
ئەوەندەش سەیر نییە ئەگەر بێتو لێکچوونێک لە نێوان ئەو وێنانە و ئاهەنگی هێڵەکانی لێناردۆ دافنیشی و فلچەوەشێنە تەماتیکیەکانی (تۆبی)دا بدۆزینەوە.

وای لێهاتووە پەیوەندی نێوان هونەر و پەرەسەندنی ژیانی هاوچەرخ روون و ئاشکرایە. میکانیکا کارێکی زۆری کردە سەر مرۆڤی سەدەی بیستەم، ئەم کارتێکردنە هونەریشی گرتەوە. ئیتر وێنەیەکی فۆتۆگرافی کەناری دەریا چیرۆکی جوانی ئاو و هەوامان بۆ ناگێڕێتەوە، ئەوەندە هەیە بوو بە هەوڵێک بۆ گەیشتن بەوەی رێبازە تازەکانی هونەری گەیشتبوونێ، لە دەربڕینی جوولانەوە و بەرزی و نزمییەکانی ژیاندا، یا گەیشتن بەوەی ئەو رێبازانە نەیان توانی بوو بیگەنێ.

دامەزراوە بیناسازییە نوێییەکانی نێو ڕێبازە هاوچاخەکانی هونەری وای لێهات لاسایی ڕووی کریستاڵ و شێوەکانی سەرپۆشی کۆکا و پیپسی بکاتەوە.
ئەو هەوڵانە گشتی لە ئارەزووی بیناساز و هونەرمەندەوە هەڵقوڵاون بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان جێی خۆی لە چەرخی تەکنەلۆژیادا بگرێت.

بەڵام بەبێ تێگەیشتنی فەلسەفەی شێوەی هونەری و یاسایەکانی هاوسەنگبوون لە ژیاندا، لەوانەیە پێ لە تەختەیەکی چرووک بنێین، هیچ ڕێگایەکیش لە پێش هونەرمەنددا نییە، بێجگە لە ڕێگای خۆبەستنەوە بە زانست و پتەوکردنی پەیوەندی بەو جیهانەی تێیدا دەژین، ئەو جیهانەی زانست دەورێکی دیاری تیا دەبینێ.. دەنا سنوورە لە ترکزەکەی نێوان ئەو جوولانەوەیەی ڕووبەڕووی ئاژاوە و شپرزەییمان دەکات و ئەوەی ڕژێم و سیستەمێک دروست دەکات تێک دەتەپێ.

لە فەلسەفەی کلاسیزمدا گیروگرفتێک لە نێوان هونەر و زانستدا نەبوو، تا ئەوەی لەم سەد ساڵەی دواییدا پەرەسەندنی زانستی و پیشەسازی ئەو بازە گەورانەی هاوێت و وای لێهات گەلێک زانستی نوێ ناوی (هونەر)یان لێ بنرێ. چونکە هونەرمەند بوو بەوەی هەر کەسێ بێت لە بواری ئەزموون و تاقیکردنەوە نوێییەکانی پیشەی خۆی تێڕوانینی نوێی هەبێ.
زانا بە چاوی هونەرمەندەوە دەڕوانێتە ژیان، هونەرمەندیش بەخۆی، دۆزراوەی زاناکان بەکار دێنێ، دەگونجێ پێ لەسەر چەند

شتێ دابگرێ کە ترسی ئەوەی لێ دەکرێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لە جیهاندا نەمێنێ.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش ئەو پەڵەیە زیاد دەکا کە هونەرمەند و زانای تیا ڕووبەڕوو دەبن و یەک ناگرنەوە، بەڵام لەسەریانە هەوڵی زیاتر بدەن لە پێناوی پیشاندان و چەسپاندنی ئەوەی هەر یەکیان پێویستی بەوەکەی ترە کە ئەم پێویستییەش دەسبەرداربوونی بۆ نییە.

●



وێنە(111) نمایشێکی وەرزشی



وێنە(112) ریزێک ئامێری کشتوکاڵی



وێنە(113) چەند برگەیەکی بڕبڕەی پشت



**وێنە(114) پەیکەری مەیموونێکی دارەوان**

# جوولانەوە و شێوە ئۆرگانییەکان و پەیوەندی بەهونەرەوە

کـــاری داهێنان دەتوانرێ بە جـــوولانەوەی ناویەوە بناســـرێ. لەبارترین نموونەش، گـەردوون خـۆیەتی لە جـوولانەوە خـڕگـرەوە بەردەوامـەکەی و ململانێ ئەبەدییـە داهێنەرانەکـەیدا کـە بەهۆی ناکۆکییەکانی ناویەوە تێی دەکەوێ.

گـەردوون لە جـوولانەوە ناکـەوێ بەبێ جـوولانەوەش نەڕابردوو نە ئایندە دەبێ، نە ئامانج و نە پەرەسەندن، وای لێدێ هەموو شتێ بەبێ مانا دەمێنێتەوە و تواناى گۆڕانی نابێ.

دروســتکردنی بایۆلۆژی و پەرەســەندنی بەردەوامی و زنجـیـرەی گۆڕانکارییەکانی، توێکاری و فـیزیکی و بنیاتنەریی کە لە بڕان نایەن، ئەمـــانە هەمـــووی تەبایی گـشـــتی ژیان و پەیوەندی قەوارەکان بە یەکدییەوە دەستنیشان دەکەن.

گەشەسەندنی هونەر بەردەوامە ، ئەمەش سەبارەت بە ئارەزووی لە رادەبەدەری گـــەیشتن بەو تەبایـــیـــە کــــە لە پێکەوە بەستن و تەواوکارییەکی دەگمەندا باڵی بەسەر رەگەزەکانی کاری هونەریدا کێشاوە. ئایا ئەو رێک و پێکییە هونەرییە بە جوولانەوەی ژیان

بەستراوەتەوە؟ ئاشکرایە کە ئەمە دەبێ، لەگەڵ ئەوەی نەشتوانین بە یاسای دیاریکراو و بڕاوەوە، وێنەی یاسایە ماتماتیکیەکان بسەلمێنین، هونەرمەند رێی خۆی دەگرێتەبەر، هەمیشەش بە هەموو هێزییەوە هەوڵ دەدا بیری پەرتی خڕکاتەوە و گڕی پێ بدا، کەسێتی لەناخی خۆیەوە ژەنگ هەڵدێنێ، هەوڵ دەدا هەموو توانا جەستەیی و هەستیی و هۆشیەکانی وەناو بێنێ تا بتوانێ بگاتە سەرەتایەکی راست و رەوانی کارە هونەرییەکەی.
روانینە بەردەوامەکانی رۆژانەی و ئەو وێنانەی کە لە خەیاڵیدا رەنگ دەدەنەوە و بیرو خەیاڵەکانی کە یەک بە دوای یەک لە پێشبڕکێ دان، ئەمانە هەمووی وای لێدەکەن زیندوو بێ و ژیانی تێدا بەردەوام بێ.
هەرچی هاوسەنگ و لاسەنگە.. ئاژاوەو رێکی.. مۆسیقا و هەراو هۆریا، هەموو ئەمانە بە ململانێ و ناکۆکیەکانیانەوە پاشخانی پێکهاتنی هەست ئامێز و سایکۆلۆژی هونەرمەند دروست دەکەن، ئەو پاشخانەی هونەرمەندی داهێنەر هەرگیز بە فیڕۆی نادا.. کەس هەیە یەکێتی بوون وجوولانەوە هەمیشەییەکەی رەت بکاتەوە؟
ئەو جوولانەوە ئەزەلییەش کە لەکاری هونەرمەنددا بە جوولانەوەیەکی دەربڕاو بە ئاواز و ئاهەنگ رەنگ دەداتەوە و بەردەوام لە نوێبوونەوە دایە و چەندی تێشی وەڕادەمێنین زیندووە و ژیانی لێ دەچکێ.
هیچ ئاوازێک بێ جوولانەوە نییە، هەر جوولانەوەیەکیش - بۆ ئەوەی بەردەوام بێ- پێویستە ئاوازێکی دیاریکراوی هەبێ..چونکە ئاواز (نەغمە) سیفەتێکی دیاری ژیان و گشت

بوونەوەرێکی ئەم جیهانەیە، لە گوێ شەیتانۆکەی نێو دەریاوە بگرە، تا دەگاتە پشتی کیسەڵی راکشاوی سەر لم و باڵی مێشوولەی سەر رووەک. بۆ نموونە هێڵە رەنگاورەنگەکانی سەر گوێ شەیتانۆکەیەک سەرنجمان رادەکێشێ و بە (ماتیۆ)ی هونەرمەندمان پەیوەند دەکا.

هەر (یەکە)یەک یا بەشێکی پێکهاتەی بایۆلۆژی گەلێک جار، لە یەک کاتدا خزمەتی مەبەستی هەمەجۆر دەکا.. بۆ نموونە هەر ئێسقانێک بۆ ئەوە پێکهاتووە بەرگەی پاڵەپەستۆی هەمەچەشن بگرێ، بەپێی ئەو شوێنەی لە هەیکەلی گشتی لەشدا گرتوویەتی، تەماشا دەکەی دەبێ بە کۆڵەگەی قورساییەک و لە توانای دایە بجوولێتەوە و خێرا بەهەر لایەکدا بیەوێ بڕوا، لەهەمان کاتدا بۆ ئەوەش پێکهاتووە کە ماسوولکەی هەمەجۆری لەسەردا تۆپەڵ بن.

بینای بایۆلۆژی بە درێژایی هەزاران ساڵ پێکهاتووە کە بەری پاڵەپەستۆ و کاردانەوەی دەماریی بەردەوام بگرێ.

ئەمانە هۆی بنەڕەتین کە شێوەی ئۆرگانی لەشێوەکانی تر جیا دەکەنەوە. بۆ نموونە لەو ئامێرەی جیادەکاتەوە کە ئادەمیزاد دروستی دەکا، چونکە ئامێر لە فەرمان وەرگرتنی فەرماندا سنووردار و دیاریکراوە، شێوەی ئۆرگانی هەر بوونەوەرێکی زیندووش لە ئاکامی پەرەسەندنی دوورودرێژ و چوارچێوەی کارکردە ئاڵۆزەکان و چەندین مەرجی دیکەوەیە. هەندێ جار ئەو کردەوانە دووبارە بوونەتەوەو پێکدی چوون، هەندێ جاریش دژ و جیاواز بوون.

شێوەی حاڵی حازری هەر لەشێک یا ئەندامێکی زیندوو بارێکە

له دۆخەکانی هاوسەنگبوون کە لەنێو (کردەی پەرەسەندنێکی) نەمر و بەردەوامدا دەبێ، بە واتا ئەم شێوەیە ئەڵقەیەک لە ئەڵقەکانی پەرەسەندن دەنوێنێ کە ئەڵقەی دیکەیشی لە پێشدا هاتووە و وامان لێدەکا بڵێین لەماوەیەکی درێژدا هی تریشی بەدواوە دێن.. ئەم شێوەیەش بەشێکە هاوسەنگبوونی گشتی بوون، دەردەبڕێ و کاکڵی سیفەتەکانیشی وەرگرتووە بە واتایەکی دی- وەک خودی خۆی- دەربڕی هاوسەنگبوونی قۆناخێکە چەمکی یاسای جووڵانەوەی گشتی دەردەبڕێ، بۆ نموونە هەر بەسەیرکردنی پێکهاتەی باڵی مێشوولەیەک دەتوانین هەست بە پێکهاتەیەکی ئاڵۆز بکەین، کە پاش چەند قۆناخێک پێی گەیشتووە، بەڵام نهێنی هاوسەنگبوون و ئاهەنگی ئەم بوونەی تێدایە.

گشت داهێنانەکانی مرۆڤ لە هونەری نیگارکێشاندا بە درێژایی مێژووی بەردرێژییەوە، دوو رووکاری لە چەمکدا جیاواز کاریان تێ دەکا:

رووکاری یەکەم:

هەوڵ و کۆششی دروستکردنەوەی ئەو شێوە و شتانەیە کە مرۆڤ ناسیونی و خووی پێوەگرتووە. لەم رووکارەدا، سەبارەت بە کاری پێکهاتنی بایۆلۆژییەوە هەستێکی ئاشکراو بەجۆش دەبینین، نموونەی ئەمەش نیگارەکانی کابرای دێرینە کە بەسەر دیواری ئەشکەوتانەوە دۆزراوەتەوە. ئەم رووکارە بەدرێژایی قۆناخەکانی هونەر بەردەوام بووە، لەهەمان کاتیشدا رووکارێکی دیکەی

جیاوازیشی لەگەڵدا بووە.

ڕووکاری دووەم:

ئەم ڕووکارەش بریتییە لە هەوڵی دروستکردنی شێوەی ئەندازەیی وەک تەرزە داهێنانێک کە هەستە هۆشییەکانی مرۆڤ دەنگ بدا و ئەو ئاهەنگە ڕووتانەی بە بیر بێنێتەوە کە لە ژیاندا هەستیان پێدەکا.
ئەو مەیلە ڕوون بووەوە و یەکەمین هەوڵی (ئەبستراکت)«[19]»یش بەسەرەتای ئەم سەدەیە بەسترایەوە. کە ئەمەش لە مێژبوو وەک شێوەیەکی ئەندازەیی و زەخرەفەئامێز لە هونەری کۆنی گریک و هونەری ئیسلامەتی و نەخش و نیگاری کابرای ڕاوچی و شوانکارە و جوتیاردا هەبوو کە ئامرازەکانی پێ دەنەخشاندن.
بەدەگمەنیش هەڵدەکەوێ هونەرێک هەبێ لەم دوو ڕووکارە بچێتە دەرەوە.

ئەدی ئێستا...!؟.

ئەمڕۆ هاوسەنگبوونێکی دیکەی ئەم دوو ڕووکارە دەبینین، نموونەی وا دۆزراوەتەوە کە دەتوانین لەچوارچێوەی هونەری ئەبستراکتی دابنێین، لەگەڵ ئەوەی جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ هەموو شتێکی ئەندازەیی و میکانیکیدا هەیە، ئەو نموونانە پەیوەندییان بە نموونە بایۆلۆژییەکانی ژیانەوە هەیە، هەروەها ئەو هاوسەنگبوونەش دەگەیەنێ کە بەرەنجامی تێکەڵاوکردنی شێوەی

ئەندازەیی و ئۆرگانی ژیانە، ئەمەش گۆتراوە هەمیشەیەکانی زۆر زانای بایۆلۆژیا دەچەسپێنێ کە دەڵێن: شێوەی ئەندازەیی و ئۆرگانیکی یەک لەوەکەی دی پەیدا دەبێ.

* وتمان زۆر جار شێوە ئۆرگانییەکان لە پێکهاتنیاندا ئاواز و ئاهەنگ (بەرزی و نزمی)یان هەیە، بەڵام ئاهەنگ و ئاوازی بەڕاستیان لە جوولانەوەیاندایە، هەروەها لە بەجێهێنانی فەرمانەکانیان و پەیوەندیان بە بەشەکانی تری لەشەوە، بۆیە دەبینین ئێسقانی مەیموونی دارەوان، کە (جیبۆن)ی پێ دەڵێن- ئەو بۆچوونە دەچەسپێنن. دەتوانین ئەوە لێک بکەینەوە کە ئەم ئێسقانانە بۆیە وا پێک هاتوون تا لە هەڵگەڕاندا یارمەتی مەیموونەکە بدەن، دیسان لە ئەنجامی ئەو هەڵگەڕانەیشەوە پێکهاتوون، ئەمەش ئەو قۆناخە یەک بەدوای یەکانەمان بۆ دەستنیشان دەکا کە پەیدا بوون تا ئەو ئێسقانانە پێکهاتوون.. "بڕوانە وێنە (114)".

لە وێنەیەکی دیکەدا تەماشا دەکەین شێوەی ئێسقانەکان هێزمان بەخەیاڵدا دێنن، ئەو هێزە لە ئەنجامی پەیوەندی ئەو ئێسقانانەوەیە بەو ماسوولکە بەهێزانەی دەورەی داون.
جا لەو تەبایی و هاوسەنگبوونەوە، کە لە جوولانەوەی ماسوولکە و ئێسقانەکانەوە پەیدا دەبێ، هەست دەکەین هەر ئێسقانێک بۆ ئەوە هاتووە فەرمانێکی دیاریکراو بەجێ بێنێ.
ئەو ئاوسان و قۆپان و پووکانەوەیەش هەمووی بەڵگەی پێکهاتنی بزێوی ماسوولکە و دەمار و ئەوان گەیەنەرانەیە کە

تەواوی فەرمانی ئەندامەکە جێبەجێ دەکەن.

بەدەگمەن هەڵدەکەوێ نەخشە کێشراوەکانی دەستی ئادەمیزاد ببینین لەو شێوانە بچێت کە لە یەک کاتدا لە فەرمانێک زیاتر بەجێ دێنن. نموونەی ئەو دەگمەنانەش کە لە شێوەیدا لاسایی شێوەی ئۆرگانی دەکاتەوە- جیندۆل-ە ئەو بەلەمەی لە کەنداوەکانی شاری ڤینیسیای ئیتاڵیادا بەکار دێ- بڕوانە وێنە (116)- شێوەی ئەو بەلەمە لە هێڵەکانیەوە پابەندی هیچ هەیکەلێکی ئەندازەیی نییە، لا تەنیشتێکی لار دەبێتەوە تا لەگەڵ سەنگی کابرای سەری بگونجێ کە هەمیشە بەلای لاتەنیشتەکەی تر لار دەبێتەوە، بۆیە کابرای سەری بەتەواوی لەسەر هێڵی نێوەڕاستدا ناوەستێ، ئەمەش وا دەکا بەلەمەکە لە شێوە ئۆرگانییەکانی ناو پێکهاتە بایۆلۆژییەکانەوە نزیک بێتەوە. ئەم تەرزە هێڵ و زیادیانەش کە نە سنووردار ونە سادە و نە تیژن، ئەمڕۆ دەخرێنە سەر شێوەی دەرەوەی نەخشە پیشەسازییەکان تاکو یارمەتی (ڕوو) بدەن خێراتر تەکان بدا. جا لەگەڵ پەرەسەندنی نەخشەی پیشەسازیدا دەبینین ئەم جۆرە زیادیانە وایان لێهاتووە شێوەی ئامێریی پێک بێنن و بیشی سەپێنن، تا ئەو ئامێرە بتوانێ بەرگەی ئەو پاڵەپەستۆیە بگرێ یا بە خێراییەکی ڕەوانەوە دەربپەڕێ و فەرمانەکانی بە ئاسانی جێبەجێ بکا.

بەڵام لە هونەردا، دەبینین لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە تەواو بەسەر ئەوەدا شکایەوە، شێوەی هونەری بەدوای قاڵبی ئامێری و شێوازە ئەندازەییەکان و ڕووی شەش پاڵوە کەڵەکەبووەکان



**وێنە(116)**
**لە بەلەمەکانی شاری ڤێنیسیا**

دەکـــەوێ. ئەمـــەش ئاشکرا لە نیگارەکـــانی قـــوتابخـــانەی (ئایندەخواز)[20] و (کۆپیزم)[21] و لە پەیکەرەکانی (لیبشس و دیکامب)دا دەبینین، ئەوەندە هەیە کـە ئەم شـێـوە کـۆپیـزمـە بێ گـیـانانە بـوون بە بەشـێک لە مـێـژووی هونەر، وەک رووگـەیەکی زیندووی هەمـیشـە لەبرەو، نەمانەوە. ئەو دەستپێشکەریەش بۆ (ئارپ)[22]ی هونەرمەند دەگەڕێتەوە کە توانی هەست بە شێوەی ئۆرگـانی بکات و هێـز و بایەخـیـمـان پێ رابگەیەنێ، تا وای لێهات زۆر لە نەخشە و شێوەکانی رێبازی ئەبستراکتی نوێ بۆ ئەو فۆرمە ئۆرگانیانە بگەڕێنەوە.

کەچی (هێنری مۆر)[23] شتێکی ترمان بۆ بەرجەستە دەکا، ئەو سەنگتـراشە ئینگلیزە لە پەیکەرەکانیدا لە تەبیعەتی (چەگڵ) نزیک دەبێتەوە، کە لە تێکەڵاوبوونی لەگەڵ بەردی لەخۆگەورەتر و توندتری نێـو ئاوەڕۆی رووبارێک کـە بە خـوڕ شـۆڕ دەبێـتـەوە پێکهاتووە، ئەمەش لە شێوەیدا جیایە لەگەڵ ئێسقانێ کە لە ئاکامی جوولانەوەیەکی خۆگر و نەشونمایەکی ئۆرگانی پێکهاتووە و پابەندی ئاهەنگێکی چەسپاوە. چەندی (چەگڵە) لە ئەنجامی بەرەنگاربوونەوەیەکی دارنەوەیە کـــــە دەگـــــونجێ ئەو بەرەنگاربوونەوەیەش بەرێکەوت بووبێ.

زۆربەی شێوە تازەکانی هونەریش لە نێوان شێوەکانی ئێسقان و (چەگڵ)دان.

شێوەیەکی دیکەش هەیە.

گەر ئێسقانێک یا (بەردە چەگڵێک) کەوتە بەر پاڵەپەستۆ و

تێکەڵاوبوون وجوولانەوەی ئەو هێزەی پێشبینی بۆ کراوە و لە سەختیدا بەهێزتر بوو ، هەست بە داوەشان و داخورانێک دەکەین، بەشێوەیەک هەستی بەهێزیی لەگەڵ گونجان و پتەوی رووەکەمان ناداتێ.

هەندێ جار پەیکەرەکانی (هێنری مۆر) و (بەربارا هیپۆرس) و هی تر ئەو هەستەمان دەدەنێ، ئەو شێوە داخوراو و هەڵوەریوانە گەلێک جاران هونەرمەندان لە شێوەکانیاندا هەڵیدێنجن بۆ دەربڕینی ئەو فشارەی مرۆڤی سەدەی بیستەم دووچاری دەبێ.

دەبێ لەسەر ئەوە سووربین شێوەی بایۆلۆژی پابەندی ئاواز و ئاهەنگێکە کە زاڵە بەسەری، بەسەر جوولانەوەیدا، چونکە پێکهاتنی بایۆلۆژی زۆرجار لە ئەنجامی هاوسەنگبوونی نێوان ئەو هۆ و هەل و مەرجانەیە کە شتەکەی پێدا تێپەڕیوە تا بە شێوەی گشتی و شێوەی بەشەکانی گەیشتووە، پاشان بەشەکانی پێکهاتوون و بە دەوری خۆشیان لە ئاکامی بەجێهێنانی فەرمانی هەمەجۆرەوە نەشونمایان کردووە.

دەگونجێ ئەو فەرمانانە دژ بەیەکدی بووبن، بەڵام هەموویان پێکەوە (سەرجەم) هۆگری یەکترن، ئەم جوولە فەرمانانەش لەگەڵ جوولانەوەی گشتی لەشدا پێک بەستراون.

وەک وتیشمان ئا ئەمە شێوەی ئۆرگانی بەدیار دەخا و جوولانەوە و ئاواز و ئاهەنگەکانیشی دیاری دەکا ، هەر ئەمەش لە شێوە ئامێرییەکانی جیا دەکاتەوە، کە تەنیا خزمەتی مەبەستێک دەکەن و لە فەرمانێکی دیاریکراو و سنوورداریشەوە بەدەر هیچ فەرمانێکی دی بەجێ نایەنن.

دیسان لەگەڵ شێوەی (چەگڵ)یش لێک دەکرێنەوە، ئەوەی

هەستی لەنگەرگیری بارستەمان وەبەردێنێ لەگەڵ ئەو هێزەی پێشیەوە دیارە.
ئەو ئەنجامەی لەمەشدا دەیگەیەنێ ئەوەیە؛ پێکهاتنی شێوە بە سێ هۆیان بەستراوەتەوە:

یەکەم:
هۆیەکان داماڵین، یا جوولانەوەی جێژیانی دەوروبەر یا جوولانەوەی دەرەکی.

دووەم:
هۆیەکانی فەرمانیی و نەشونمای پێکهاتن، یا جوولانەوەی ناوەکی.

سێیەم:
دروستکردن و نەخشەکێشانی هونەری یان هارمۆنی و گونجان و یەکبوون بۆ ئاهەنگی جوولانەوەی هەردوو جۆرەکەی پێشوو.
ئەم بەشانە، وەک پەیوەستی مرۆڤ بە ژیان یەک بەوەکەی دی بەستراوەتەوە، ئێمەش وەک تاکەکەس کار دەکەین... جا بۆ ئەوەی راستیمان لێ ون نەبێ نابێ تەنیا بە بینینی ئەو بەشەی کاری تێدا دەکەین بوەستین و لەو سنووره تێنەپەڕین، بەڵکو

دەبێ بە دەوریدا بگەڕێین و سنوورەکانی ببەزێنین و ئەو بەشە بەگشت و بە بوون ببەستینەوە و جوولانەوە و دینامیکیەتی تەواوی گەردوونی تێدا ببینین، بەم جۆرە زانیارییە مرۆڤایەتییەکانمان دابین دەبن بەوەی حەقیقەت لە ناخی شتەکە خۆی دایە، قسەکەی (هیگڵ)یش دەسەلمێ بەوەی "حەقیقەت خڕگرتنەوەیە".

●



**وێنە(117) پێکهاتەی گەڵا**



**وێنە(118)**
**ناوکی سەرکە زونبووقەیەک**



**وێنە(119)   نووسینی چینی و ژاپۆنی**



**وێنە(120) پەنجەرەیەک بە شێوەی ڕکۆکۆ**

## جوولانەوەی بایۆلۆژی و کاری هونەری

منداڵ یا هونەرمەند دەست دەداتە قەڵەم وێنە بکێشێ، ئەمە جوولانەوەیەکی خوازەکییە. ئادەمیزاد هەناسە دەدا، ئەمە جوولانەوەیەکی نەخوازەکییە، کە هەستی بە مەترسییەک کرد دەستی کێل دەکاتەوە و بەرگری لەخۆی دەکا، ئەمەیان جوولانەوەیەکە خوازەکی و نەخوازەکی تێیدا هاوبەشن.
جوولانەوەی خوازەکی هەیە، هی ناخوازەکیش هەیە، جوولانەوەش هەیە لە یەک کاتدا خوازەکی و نەخوازەکییە. لەشی بوونەوەری زیندوو لە جوولانەوەیەکی هەمیشەیی دایە. شانە لە جوولانەوەیەکی هەمیشەیی دایە، پرۆتۆپلازمیش هەروا، لە جوولانەوەیەکی هەمیشەیی دایە، هەموو شانەیەک مەڵبەندێکی جوولانەوەیی تێدایە،بۆیە شانە دابەش دەبێ و زاوزێ دەکا، لە پێناوی خۆراکدا دەجوولێتەوە، هەندێ جار بە دەوری خۆراکەوەیەو هەندێ جاریش خۆراکی لەبەر دەڕوا، لەگەڵ نابووتیشیدا هەموو نیشانەو پێکهاتەی ژیان و بوونەوەری زیندووی تێدایە لە هەڵمژین و دەردان و زاوزێوە.

جوولانەوەی خوێن و شلەش لەلەشی ئادەمیزاددا جوولانەوەیەکی هەمیشەییە، کە ئەمەش لە ئەنجامی پێویستییە بایۆلۆژییەکانییەوەیە.
ئەو شانانەی لەشی ئادەمیزاد پێک دێنن ناخرۆشێن، کەچی ئادەمیزاد خۆی دەخرۆشێ و وێنە دەکێشێ، خرۆشینەکان یەکسان دەبن، بەڵام ئەوەی لای هەرکەسێ گرنگ بێ، توانای دەربڕینە، ئامرازێکی تیژ بە رووبەک دادێنێ بۆ ئەوەی جوولانەوە دەربڕێ.
ئەوەی لای منداڵەکە گرنگ بێ دەربڕینێکی ئامێریانەیە، هەست کردنیەتی بەشێوەو بۆشایی و جوولانەوە. رەگ و ریشەی ئەم هەستەشی بۆ سەرەتای منداڵی دەگەڕێتەوە چونکە هەر لەسەرەتای ژیانییەوە، هەمیشە لە کۆشش دایە بگاتە ئەوەی بەهەستی بۆشایی دەوروبەری دەربڕێ و لەناویدا بجوولێتەوە و بەدەست و پێ وێی رابێ، ئەو بۆشاییە بە چەشنێک تێکەڵ بکا وەک بلێی بەرەنگاری قەوارەیەکی نەدیو دەبێتەوە، جا لەو ساتەی قەڵەم لەدەست دەگرێ، لەو ساتەدا حەز دەکا خودی خۆی دەربڕێ، هەروەها ئەو بۆشاییەش کە دەیەوێ نابووتی بکا.

ئەو دەیەوێ بەسەر بۆشاییدا زاڵ بێ، سەرکەوێ بەسەریا، لە جوولانەوەو هەراو هۆریای هەڵکێشێ. ئەو ڕنراوو هێڵانەی پەیدایان دەکا چی دەگەیەنن؟ ئەوە زمانێکی تایبەتە بەخۆی، شتێک لەسەر کاغەزەکەدا دەڕوا، یا بەواتایەکی دی شتێک منالەکە پالی پێوە دەنێ، شتێک پێیەوە هەست بەخۆی و بە بوونی خۆی دەکا، هێڵەکان لە پێشیدا دەجوولێنەوە، ئەویش خۆزگە دەخوازێ قاچە باریکەلەکانی بیانتوانیبایە لە جێی ئەو

هێڵانە بوونایەو ئەو فەرمانانەیان بەجێ بهێنابووایە، بەم چەشنە ئەم هێڵانە بە گوێرەی منداڵەکە دەبنە ئاوازی ژیان، بە گوێرەی هونەرمەندیش هەر بەو جۆرە، دەبینین منداڵان لەهەست بەژیان کردندا پڕ دەبن، هێڵ و بازنەی بە پێچ و لوول دەکێشن تا لاپەڕەکەی پێ تەنگ ببێتەوە، زۆربەی منداڵان لە حەز و ئارەزوویاندا- بەدەستێک دڵیان ئاو ناخواتەوە، بۆیە لە پەلەپەلیان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی هەردوو دەستیان دەخەنە کار، هەندێک جار لەگەڵ ئەو بازنانەدا شێوەی دیکە سەر هەڵدەدەن، ئەو شێوانەش بریتین لە دووبارەبوونەوەی هێڵەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوەو لە سەرەوە بۆ خوارەوە.

لە بەرامبەر ئەم شێوانەشدا هەست دەکەین قەڵەمی دەستی منداڵەکە بە ستوونی دەبزوێ، ئەو دووبارەبوونەوانەش ئمە ئمی منداڵەکەمان بەبیر دێنێتەوە، مم...م.مم. ئمە- مچە.. چ..م.. یا ئەو قسە پەڕاندنەمان بۆ دەچەسپێنێ، کە ئەمەش بە دەوری خۆی سەرەتای کۆششیەتی بۆ ڕێکخستنی دەنگەکان کە ئەو برگانەی لێ پەیدا دەبێ، بەمجۆرە ئارەزووی دەربڕینی ئاهەنگ یا جوولانەوەی ناوی یا ئاهەنگێکی بە بزاڤ لای منداڵەکە سەرهەڵدەدەن.
دوای دووبارەکردنەوەی ئەو هێڵ و بازنانەش سەیر دەکەین زیاتر ئاهەنگ و هێڵ دێنەبەر شێوەکان، تا دەگاتە ئەوەی هێڵە خوار و خێچ و شکاوەکان دەدۆزێتەوە، ئیتر کەیفی خۆشتر دەبێ، چونکە ئەو هێڵانە بە چەشنێک لەگەڵ هەستیدا یەکدەگرنەوە بە تەنێکی بە بزاڤ دەچن، ئەمەش تەنیا گوڕپێدانێکە، دەستی منداڵەکە

بەسەر کاغەزدا دەڕوا، وەک ئەوەی باڵندەش لە ئاسماندا دەفڕێ، یا ماسی مەلە لە ئاودا دەکا.
هونەرمەندیش گەورە دەبێ و لە زۆر کۆت و پەیوەند رزگاری دەبێ کە بە حوکمی سەنعەتکاری و ململانێی دژی قاوخان بەسەری سەپاوە، جارێکی دی دەبێتەوە منداڵ و بەسەربەستی تاو دەدا و بە ئازادی دەردەبڕێ و دڵخۆش بوونی بە ژیان دەگاتە ئەوپەڕی، ئەمەش هەمان ئەو ئەلف وبێیەی جارانیەتی..
سێ شتی بنەڕەتی توانای داهێنان لای منداڵ، دوابەدوای ئەویش لای هونەرمەند دەستنیشان دەکەن:

1- هەستکردنی بە بۆشایی بێ پایان، وەک ئاسمان کە دەکرێ ئەستێرەیەکی تێدا بسووڕێتەوە یا مەلێکی تیا بفرێ.
2- هەستکردن بە هێڵی درێژی و پانی کە تێکدەپەڕن و یەکتر دەبڕن، بەم یەکتر بڕینەشیان هاوسەنگ بوونێک پەیدا دەکەن، ئەم هاوسەنگ بوونەش لەخۆیدا سەرکەوتنە بەسەر تیۆری (قورسایی).
3- ئەو هێڵەی گوڕ دەدا و پێچاوپێچ و لوولەیی لە دەوری خۆی دەئاڵێ، وەک سەماکەرێک، سەما دەکا، یا پەپوولەیەک دەخولێتەوە، گەلێک جارانیش هەر بەمانە واتای کارێک پێکەوە دەلکێنن.
خەڵکی سەرسام دەبن کە لە منداڵێک بپرسن ئەو هێڵانەی دەیانکێشێ چین؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە "ئەوە ماڵە" یا " ئەوە مراوییە" یاخود سەیری ئەو بازنەیە دەکا کە کێشاویەتی دەڵێ: "ئەوە بابەیە".

جا چونکە منداڵ هۆشی بۆ هۆیەکی ماقووڵ ناچێ کە پاڵی پێوە دەنێ ئەو هێڵ و وێنانە بکێشێ، بۆیە هەمیشە دەیەوێ چەمک و مانایەک بۆ هەر شتێکی وێنەی دەکێشێ بدۆزێتەوە.
مرۆڤیش بەدەوری خۆی هۆشی بۆ هۆیەکی ماقووڵ ناچێ کە پاڵی پێوە دەنێ هونەری خۆش بوێ، بۆیە هەمیشە دەیەوێ مانا و هەنجەتی بۆ بدۆزێتەوە.

چاو دەبینێ، دەستیش هەست پێ دەکا.. بینین و سوانیش یەکەمین هەستی دۆزینەوەی ژیانن.
کە دەست توانای ئەوەی دەبێ لەگەڵ سەرجەمی دەمارەکاندا بێتەوە، ئەوە دەردەکەوێ کە قورسایی شتەکە تا چ رادەیەکە، کە دەستیش توانای هەڵگرتنی شتێکی دەبێ، قورساییەکەی بە کۆ ئەندامی دەمارییەوە دیاری دەکا کە قاچیش توانای ئەوەی دەبێ قورسایی لەش لە بۆشاییدا بێڵێتەوە. تەنیا لەم ساتەدا پێوەرە چەسپاوەکانی کۆ ئەندامی هەست لەلای ئادەمیزادەوە پێک دێن، ئەو دەمە ئادەمیزاد دەتوانێ جوولانەوەی هێڵێکی خوارو خێچ (زیکزاک)ی نێو بۆشاییەک و جوولانەوەی چاڵمەی سەعات پێک ببەستێتەوە ئەوە ئەگەر هێڵەکە لەگەڵ جوولانەوەی چاڵمەکەدا هاوکات بن. هەمان جوانیش لەلای هەردووکیاندا دەبەخشێ، منداڵ و هونەرمەند پابەندی دڵەکوتە و خوێن و هەناسەدانیشن.

وەکو وتمان منداڵ هێڵی خواروخێچ لەسەر کاغەزدا دەکێشێ، ئەمەش وەک پیاسەیەکە بۆی بە ناو بۆشاییدا، کە بازنەیەکیش

دروست دەکا و دوو هێڵی ستوونیشی لەژێردا دەکێشێ، ئینجا هێڵێکی ئاسۆییش بەناو بازنەکە تێدەپەڕێنێ، ئەوە لە راستیدا دەیەوێ رووکارەکانی جوولانەوە بخولقێنێ، لەگەڵ ئەوەش لێی بپرسین دەڵێ (ئەوە بابەیە)، بەڵام ئەوە ئاقڵی بە ئەبستراکت و بێ پایان ناشکێ، بۆیە دەیەوێ بە هەرچی دیار و پێش چاوو بە قەوارەی ببەستێتەوە.
بەم جۆرە مرۆڤ هەمیشە دەیەوێ وێنە ئەبستراکتەکان بە بەرجەستەکان ببەستێتەوە. بازنە و هێڵی بە بۆشاییەوە هەڵواسراو، بە گوێرەی منداڵ و هونەرمەند، سەرکەوتنێکی راستەقینەیە بەسەر قورسایی ئەو شتانەی هەستیان پێدەکا. دەستی منداڵ یا هی هونەرمەند، هێڵی رووەو ژوور یا سەرەو خوار دەکێشێ کە لە جوولانەوەیدا لە ژێر رکێفی هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوەیە.
منداڵ بێ یا هونەرمەند، بە هێڵەکانی سەر کاغەز باز دەدا یا ئەوەتا لەگەڵ هەناسەدانییەوە دەفڕێ، وەک سەماکەرێک کە بەرەو ئاسمان خۆی هەڵدەدا.
کەواتە ئەوەی وەکو بەهایەکی بێ پایان سەرنجمان رادەکێشێ، ئەوە لە راستیدا منداڵەکە خۆیەتی یان هونەرمەندەکەیە، ئازادی و زیندوویی و سەرکەشیەتی، وەلێ پاشان سامانێکی هونەریمان لەم شێوانەدا دەست دەکەوێ کە هەمیشە لە تێگەیشتنی نهێنی دەوڵەمەندی و جوانییەکەیدا دەستەوەستانین.
هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوە لەگەڵ جەمسەری ئاوازی هێڵەکاندا جووت دەبن، کە منداڵ یا هونەرمەند دەیەوێ هێڵێک بەرەو بالا ببا، ئەوا ئەو بەرزییە لەگەڵ تەواوبوونی

هەناسەوەرگرتندا تەواودەبێ، بە پێچەوانەیش کە ویستی هێڵێک سەرەوخوار بباتەوە، ئەوا قولاییەکە لەگەڵ تەواوبوونی هەناسەدانەوە تەواو دەبێ، کە بشیەوێ هێڵەکە درێژ ببێتەوە، ئەوە پێویستە پەلە بکا، تاکو پابەندی مەودایە کاتییەکەی هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوەی بکا، ئەگەر بیەوێ لەگوڕ و لە جۆشی و زیندوویی هێڵەکان بپارێزێ. دەنا هێڵەکەی لەگەڵدا خاو دەبێتەوە و زیندووییەتی تیا نامێنێ و تەوژم و گوڕی خۆی لە دەست دەدا.

لەشی هونەرمەند یا منداڵ هەناسە دەدا و دەژی. هەست بە دەوروبەرکردنیشی، لە رەقی و خاوی شتەکان، هەروەها لە قورسایی و سوکییاندا..تاد، هەموو ئەمانە دەبن بە چوارچێوەیەکی بەهێزی داهێنانە هونەرییەکانی.

●





وێنه(121) ململانێ



**وێنە(122) ململانێ لە نێوان دوو یاریزاندا.**



**وێنە(123) تەن لە کاتی بەربوونەوەدا هاوسەنگ دەبێ**



وێنە(124)
هاوسەنگبوونی مێشوولە لە سەمادا



وێنە(125) ململانێی نێوان دوو مێشوولە.



وێنە(126)
گرژبوون و خاوبوونەوە





وێنە(127)
ماسوولکەی باسک لە گرژبوونەوەدا



وێنە(128) چەند نموونەیەک لە لەشی ئادەمیزاد لە کاتی جوولانەوەدا

## ئاهەنگ و هاوسەنگبوون لە جوولانەوەدا

شـــەو و رۆژ و یەک بەدوای یەک هاتنی کــژەکــان و پەیوەندی ئەستێرەکەی ئێمە- زەوی- بە ئەستێرەکانی دیکەوە ئاهەنگی ژیان دیاری دەکەن..

خـولانەوەی مــانگ بەدەوری زەوی و هی زەوی بە دەوری خـۆر و کێشی زەوی، ئەمانە هەمووی ئاهەنگی گشتین و گشت بەکەرت و کەرتیش بە گشت دەبەستنەوە.

ئەم یاسا گــەردوونیــانەی ســرووشت و یاســا بایۆلۆژییــەکــانی ئادەمیزادیش، تەنانەت رادەی قەبارەی کێش و درێژی پەیوەندی ئـادەمــیــزاد بە قــەبارەی بوونەوەر و رووەکی دەوروبەری دیاری دەکەن.

ئا ئەمـەیە جـوولانەوەی نەوەسـتـاوی ژیان کـە بە دەوری خـۆی، ئەویش بزاڤی ئادەمیـزاد دیاری دەکـا، چۆن بە شەو رادەکشێ بە رۆژیش لە کـۆششی ژیاندایە، کـاتێ دەچێتە نێو خۆشییـەوە یا رادەپەڕێ و ڕێ دەکا.

ئەمە بزاڤێکە جوولانەوەی ئادەمیزاد دیاری دەکـا و دەیخانە ژێر رکێفی یاساکانی هاوسەنگبوون و رەخسینەوە.

تەنی ئادەمیزاد دەجوولێتەوە، هەرچەندی جوولانەوەی پابەندی هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوە بێ، ئەوەندە جوولانەوەی نەرم و ئاهەنگاوی دەبێ.
ئێسقان بۆ لەش دەبێتە کۆڵەگە و سیستەمێکی گشتیشی پێ دەدا، بەتایبەتیش لەکاتی جوولانەوەدا. ماسوولکەکانی فەرمانی بە بزاقیان هەیە و لەکاتی جوولانەوەدا، بۆ بەجێهێنانی ئەو فەرمانانە پاڵ پێک دەدەن، ماسوولکەیەک دەچێتەوە پاڵ یەک و وێک دێتەوە، ئەوی دی لە باڵ یەک دەچێ و درێژ دەبێتەوە. ئێسقانەکان بە چەشنێک پێک هاتوون کە هەر ئێسکێک دەتوانێ لەبەجێهێنانی فەرمانەکاندا یاریدەی ئەوەکەی تر بدا.
دڵ لێدەدا، ئەوە رەگەزێکی پێشڤەبرە، خوێن دەبزوێ بەڵام رەگەزێکی پاشڤەبرە. سییەکان خوێن وەردەگرن و دوای پاڵاوتنیشی هاوبەشی لە ناردنیدا دەکەن. ئەمە کۆڵەگەیەکی نێوەراستەیە، خوێن دەبزوێ و جارێکی تر بۆ دڵ دەگەرێتەوە، جارێکی دی بۆ پنتی دەستپێکردن دەگەرێتەوە.
ئاهەنگ لە سادەترین شێوەیدا، وێنەی لێدانی دڵ جوولانەوەیەکی رێک و پێکە، جوولانەوەیەکە بە یاسایەکی چەسپاوەوە دەور دراوە، هەر جوولانەوەیەکیش یاسایەکی چەسپاو دەورەی نەدا، لە ئاژاوە تێناپەرێ.
دەربرین دەبێ جوولانەوەیەکی لەگەڵدابێ، جوولانەوە سەرەتای مۆسیقایە، هونەریش لەسەر پەیوەندی جوولانەوە و سرەوتندا دەوەستێ. ئاهەنگی دەنگ و شێوەکاریش پێویستە لە ژێر رکێفی تەواوکارییەکی ماتماتیکی و ئەندازەییدا بێ. لەشی ئادەمیزاد لە جوولانەوەیدا ئاهەنگێکی ئەندازەیی و ماتماتیکی هەیە.

ئەگەر لە بێ گرێیی و ئاسانی جوولانەوەی دەستی ئەکتەرێک یا قاچی سەماکەرێک رابمێنین، دەردەکەوێ کە ئەگەر ئەو چەشنە بزاڤانە پابەندی ماوەی کاتداری هەناسەوەرگرتن و هەناسە دانەوە نەبن، ئەوە نە ئاسان دەبێ و نە ئاهەنگی تیا دەبێ.

جوولانەوە لە لەشی ئادەمیزاددا لەسەر هاوسەنگبووندا دەوەستێ. هەر جوولانەوەیەک کۆمەڵێک ماسوولکەی لە دۆخی گرژبوون و کۆمەڵێکی دیکەی لە دۆخی خاوبوونەوەدا پێ دەوێ، بۆ ئەوەی هاوکێش بن و هاوسەنگی بە جوولانەوەکە بدەن.

یاساکانی ئاهەنگ و هاوسەنگبوونی نێو جوولانەوەی لەشی ئادەمیزاد، لە سرووشتدا و لەکاری هونەریشدا رەنگ دەدەنەوە.

●



وێنە(129)
ئاهەنگی سەر رووی لم



وێنە(130)
دیکۆری ناوەوەی ساختمانێک



وێنه(131)
ئاهەنگی  ستوونی و
ئاسۆیی



وێنه(132) تابلۆیەكی ئەبستراكتی

## جوولانەوە و قوتابخانە هونەرییە هاوچەرخەکان

هەمـوو شتـێک دەجوولێـتەوە، هەمـوو شتـێک دەگۆڕێ، هەموو شتـێک نوێ دەبێـتەوە، بوونەوەری زیندوو لەسەر بارودۆخـێکدا نامێنێتەوە.

ئەسپ لە غـارغـارێندا چوار پەلی نیـیـە، بیـسـتی هەیە. ئایین سـرووشی بە هونەرمـەندانی سـەردەمـەکـانی پێـشـوو داوە، ئەو کـاتەی هەوای بیـروباوەڕ لە کـەللەی دابوون، هەناسـەیان تیـا هەڵدەکـێـشـا. وەکی دی هونەرمـەندی سەدەی بیسـتـەم خۆی لە بەرامـبـەر هۆیەکی دیکەدا دیـتـەوە کـە سـرووشی لێ وەربگرێ.. ئامـێـر، چەمک و کـاکـڵی سـەدەی بیـسـتـەم، هیـچ شتێ لە پۆڵا جـوانتـر نیـیـە کـە جـوولانەوەی لێ هەڵدەقـوڵێ و بە جـۆرێک دەردەپەڕێ لێک لێکانێ لەگەڵ ڕەشەبادا دەکا.

بەلای هونەرمـەندی ئایندەخـوازەوە، بوونی راسـتـەقـینەی هەر فـۆرمـێک جـوولانەوەیە، لەسـەرەتای سـەدەی بیـسـتـەمیـشـەوە داهێنانی تازە هاتە نێـو ژیانی ئادەمـیـزادەوە ئەم هاتنە ناوەش رواڵەتی نوێی لەگـەڵدا هات کـە جـوولانەوە بوو، بەمـەش هەمـوو

ڕواڵەتەکانی دی پاشەکشەیان بۆ دەرکەوتنی جووڵانەوە کرد بەوەی یاسایەکی بەروەڕووی ژیان و ماددەیە.

بە پێشەوایەتی (ڕۆسیلۆ) و (مارینتی) و (بۆکینی) و (سیفرینی) یەوە ئایندەخوازی پەیدا بوو.
(فیلیۆ تۆماس مارینتی) شاعیری ئیتاڵی (کە ساڵی 1876 لە ئەسکەندەریە هاتۆتە دونیاوە)، نەک هەر تەنیا دامەزرێنەری ئەو ڕێبازەیە، بەڵکو هێزی بزوێنەری گرووپەکە هەمووی بوو. چوست و چالاکی و لە گوڕ و لە جۆشی و بڕوای ئەو شاعیرە بوون بەهۆی ئەوەی ئەو ڕێبازە لایەنگیری بۆ پەیدا بێن و بڵاوببێتەوە.
ڕێبازی ئایندەخوازی، تا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیش هەر بەردەوام بوو، لەسەرەتای شۆڕشی بەڵشەفیشدا هونەرمەندانی رووس لایەنگیری بوون، ئەو دەمە هونەری رەسمی میری لە ژێر دەسەڵاتی ئاژاوەچییەکاندا بوو، سەردەمی فەرمانڕەوایی (ترۆتسکی) کە بڕوای بە پێشکەوتنی هونەری هەبوو..
ئەوانەی بانگی ئایندەخوازیان لە رووسیادا ڕاهێشت مایکۆفسکی شاعیر و هونەرمەندی دەرهێنەر مایەرهۆڵد و نیگارکێشان، تاتالین و ماڵفیچ و ماکۆلۆڤ و چەندانی تر بوون.
ئەو ڕێبازە کە بەوە لە ڕێبازەکانی دی جیا دەکرایەوە پشت بە جووڵانەوە دەبەستێ و سوورە لەسەری، هاوسێ لەگەڵ ڕێبازی سوریالیزم و کۆپیزم و دادائیدا ڕۆییوە. هەندێ جار زۆری نەدەما ئەو ڕێبازانە یەک بگرنەوە، بەوەی لای هەندێ هونەرمەند قەوارەیەکی یەکخراو بوون.

ئەو رێبازانە لەوە دەرنەچووبوون کە لە داب و نەریتەکانەوە یاخی بوون و ئامانج و داوایان چەشنێکی تازەی رۆمانتیکی نوێ بوو، کە رۆمانتیکی باوی ئەوسا و گۆشەگیری تورِ بدا، بەمەش جۆرە شاعیریەتێکی دێتەبەر کە لەگەڵ جوولانەوە و نوێ بوونەوەدا بێتەوە، ئەگەر ئەو نوێ بوونەوەیە ئامێریەتێکی لە رادەبەدەریشی بەخۆوە گرتبێ.

مارینتی ئەوەی راگەیاند کە جوولانەوە و خێرایی بە خوداوەندی خۆی دەزانێ و لەو بڕوایەدا بوو تۆپێکی نوێیە و جوانی لێ هەڵدەقوڵێ، وەکو ئەوەی ئاشکرای بکا کە (ترومبێلێکی پێشبڕکێ زۆر لەسەرکەوتنی سامۆسراک)ەوە جوانترە، دیسان ئەوەشی راگەیاند کە (کات و شوێن لە دوێنێوە مردوون و ئێمە ئەمڕۆکە لە موتلەقدا دەژین).
ئاشکرابوو ئایندەخوازی - وەک بزووتنەوەیەکی هونەری- لەوە قووڵتر بوو کە تەنیا یاخیبوونێک بێ دژی سرەوتنی شێوە و بارستە، لەوەش زیاتر بوو کە دیاردەیەکی سرووشتی هونەر بێت و گیانی سەردەم دەربڕێ.

ئایندەخوازی هونەری بە ژیانی سەردەم بەستەوەو چووە ناو زۆربەی رێبازەکان، تا بە تەواوی لەگەڵ رێبازی (ئەبستراکت)دا یەکیان گرتەوە، بەوە رێبازەکانی دی وەک کۆپیزمی بوارد و سنووری بەزاندن.
ژیان وزەیەکی لە جووڵە نەکەوتووە، ئایندەخواز و ئەبستراک ویستەکانیش کێشەی هونەریان بە گیروگرفتەکانی ئایدیای

سەردەم بەستەوە. ئەم پەیوەندییە توندوبەندەش وای لێکرد ببێت بە مەڵبەندی گوڕدانی هەموو ڕێبازە هونەرییە هاوچەرخەکان، وەکو ئەدەب و ئاکشن و کینتێکس و ئەبتێکس.
ئێستاشی لەگەڵدابێ، لەهەر کوێیەک جوولانەوە ببێ بەو ڕەگەزەی گوڕدانی هونەر لە پنتێکەوە بۆ پنتێکی تر دیاری دەکا، ئەوا کاریگەری ئایندەخوازی لەگەڵ پەرەسەندنی بەردەوامی هونەر دایە.

•



وێنە(133) تابلۆیەکی هونەرمەندی سەنگتراش هێنری مۆر



وێنە(134)
چەند دارێکی
وشکەوەبوو



وێنە(135)
وێنەیەکی دەسکردی هونەرمەند (ئارپ)



وێنە(136)
(داتاشراوێک)ی دەستکردی هونەرمەند (ئادەم)



وێنە(137)
تابلۆیەکی هونەرمەند - گۆیا -



وێنە(138)
قەڵەمکێشێک کە جوولانەوەی تابلۆکەی سەرەوە دەردەخا



**وێنە(139)**
**تابلۆیەکی هونەرمەند – جیری کۆل –**



**وێنە(140)**
**قەڵەمکێشی هەمان تابلۆی سەرەوە کە جوولانەوەی تیا دەردەکەوێ**

# جوولانەوە
# وەک دەروازەیەک
# بۆ تێگەیشتنی کاری هونەری

پەڵەیەکی سپیمان لەسەرەوەی وێنەیەکدا بۆ دەردەکەوێ وەک بڵێی هەنگاو دەنێ لە چوارچێوەی تابلۆیەکەدا بێتە دەرێ و رووبەڕووی خوارەوەی وێنە رەشە تۆخەکە دەبێتەوە.
پەڵە سپی و رەشەکان بەیەکدا دەچن و بەهۆی جوولانەوەشیان هێڵی دەرەوەی شێوەکان دیاری دەکەن.
بۆ شیکردنەوەی کاری هونەری پێویستە کارەکە لەو توخم و رەگەزانە رووت بکرێتەوە کە دایان پۆشیوە، ئێمە کە سەیری وێنەیەک دەکەین هەوڵ دەدەین گشت شارەزایی و ئەزموونە بینەوەرییەکانمان بەکار بێنین. بۆ نموونە چیرۆکێک کە هونەرمەند سرووشی لێ وەرگرتووە و دەری بڕیوە، هەروەها ئەو نیشانە و هێمایانەی بابەتێکی وەبەرهێناوەو ئەو وردەکارییانەی وەستایی پیشان دەدەن ئەوە دەسەلمێنن کە دەستی بەسەر کارەکەدا دەشکێ.
هەموو ئەمانە وەک چەند هۆیەک کار دەکەنە سەر حوکمەکانمان بەسەر بەهای هونەری کارەکەوە داشی دەپۆشن.
کار دەکەنە سەر ئەو حوکمانەمان کە بەسەر بەهای پێکهاتن و بنیاتنانییەوە دەیدەین.. بەڵام ئەم تەرزە هۆیە بریقەدارانە کە

بەهای راستەقینەی کارەکەیان پێ دادەپۆشرێ دەبێ کە لا بخرێن تا بتوانین بە پێکهاتنی ئەو دیویشی بزانین.
توانای رووتکردنەوەی کارێکیش لەو کاریگەریانە، لەپاش ئەزموون و تاقیکردنەوەی بەردەوامی شیکردنەوەی کاری هونەرییەوە نەبێ نایێ، دەبێ هەموو رەگەزە ئەدەبی و ئەوانەش کە دەچنەوە سەر رەخنەی ئەدەبی وەلا بنرێن و بگۆڕدرێنە سەر روانگەیەکی هونەری. دەبێ هەر رەنگ و رووبەرێک هەم بە تەنێ و بە پەیوەندیشی لەگەڵ رەگەزەکانی دیکەدا ببینین.. ئا لەم کاتەدا دەتوانین پێکهاتنی کاری هونەری ببینین و بەها و نرخی راستەقینەی هەڵبسەنگێنین، ئەو بەهایە راستەقینانەش کە بنیاتنەری کاری هونەرین بە هەڵچوونی هونەرمەندەوە بەندن.
هەڵچوون هەمیشە بە دوای هۆی دەربڕیندا دەگەرێ، لە قەوارەیەکی ماتریالی و هەست پێکراودا دەگەڕێ، لە شێوەو پێکهاتەیەک دەگەڕێ کە بەهۆیەوە بتوانرێ هەستی ئەو کەسەی کارە هونەرییەکە دەبینێ، بجوولێنێ.
لەهەموو کارێکی هونەریدا دونیایەکی ناوەوەیی ئەبستراکتی هەیە کە لەسەر ترس و گومان و بەختیاری و قایل بوونەوە دروست بووە، دونیای ناوەوەش ساتەکانی سرووش و تەکان خواردن دروستی دەکا. بەڵام جیهانی دەرەوەی کاری هونەری لە نیشانەی دیکەوە پێک دێ کە وەک بەرگێک بۆ نرخی بینای راستەقینەی هونەرییەوە بەکار دێ، جا ئێمە کە دەمانەوێ لە کارێکی هونەری بگەین پێویستە ئەو بەرگە بدڕێنین.
جۆتۆ و فرانجیلکۆ و چیمۆبواو چەندانی دی لەو نیگارکێشانەن کە پێش سەدەی بوژانەوە- رێنیسانس- لە ئیتاڵیادا هاتن

پەڵەی تۆخ و کاڵیان بەکاردەهێنا بۆ وەدەستخستنی جوولانەوە.
لەوانەیە ئەو بەکارهێنانە، لە بەکارهێنانێکی دیکەی پەڵە تۆخ و کاڵەکانەوە جیا بێت، لێرەشدا مەبەست لە بەکاربردنێکی دراماتیکییە کە لە زۆربەی قوتابخانە نوێیەکاندا دەردەکەوێ.
رادەی ئەوەش کە هونەرمەند لە رێگای نیگارکێشانی بابەتێکەوە دابینی دەکا، سەبارەت بە چەند هۆیەکەوە، لەوان هۆیانەش، سەرکەوتنی لە دەربڕینی روانینەکانی و توانای دارشتنی وزە هەڵچووەکانی لە قاوخێکی شێوەکاریدا، هەروەها توانای پێکەوە گونجاندنی بەرئەنجامی شارەزایی لە پیشەکەو شارەزای لە بەکاربردنی چاوەکانیدا ماوەی چەند ساڵێک.
ئایا کە هونەرمەند وێنەی بابەتێک دەکێشێ داخۆ بە باری دەروونی و هەڵچوونەکانییەوە بەندە؟ داخۆ بابەتەکانی بە پێی باری دەروونی خۆی هەڵدەبژێرێ، یان بابەتەکە هەڵچوونەکانی دیاری دەکا و دایدەرێژێ؟
بەهیچ جۆرێک ناشێ بابەت تاقیکردنەوە و ژانگرتنی هونەرمەندی راستگۆ لەداهێناندا تێک بدا، چونکە لەلای ئەو ئەنگیزەی داهێنان ئەو یاخیبوونە سرووشتییەیە کە لە نێوان هونەرمەندی رەسەن و کۆمەڵگایەکی لادەرەوە وەستاوە.
نموونەی ئەوەش تابلۆکەی (گۆیا)یە- وێنە (137) داخۆ دەتوانین بڵێین گۆیا کە ئەو بابەتەی هەڵبژاردووە بریتییە لە (مەیدانی زۆرانبازی) لە بەر ئەوەی لەبارێکی دەروونی وادا بووە تیایا دووچاری کێشە و ململانێیەکی بەهێز بووەتەوە؟ یان بابەتی مەیدانی زۆرانبازی ئەو زیندەگی و خرۆشەی بەگۆیا داوە.
ئەو بابەتە واتە (مەیدانی زۆرانبازی) لە دەربڕینی کێشە

ئەزەلییەکەی نێوان هونەرمەند (وەک مرۆڤێک) و کۆمەڵگایەکەیەوە زیاتر نییە.
کارەکانی تریش هەر بەو چەشنە کە هەوڵمان داوە ئەو بزاڤەی تیایان دەگەڕێ پیشانی بدەین، ئا ئەو بزاڤ و زیندەگییەی لە کاری مامۆستا مەزنەکاندا هەستی پێدەکەین و لەکاری پیشەوەرە شارەزا و بۆرە نیگارکێشەکاندا نییە.

•

بەشی سێیەم
زمانی شێوەی هونەری

# دەربارەی زمانی شێوە

(هەست بە ژیان دەکەین و دڵمان پێیەوە دەبێ...بۆیە رایدەگرین و وەک شتێکی هەست پێکراو لە نێو دەستماندا دەیهێڵینەوە.)

لە سەر زمانی شێوەکاریی نووسین و تێگەیشتنی جەمسەرە ژێر بێژییەکانی کارێکی ئاسان نییە چونکە لێرەدا کارەکە وەک هەموو شتەکانی دیکە پەیوەندییان بە حاڵیبوونی ئێمەوە هەیە بۆ هونەر و راستییەکانی، لەپێش هەموو شتێکدا پێویستی بە جەمسەری راستەقینەی هەست و پێزانین و تێگەیشتنێکی چاکەوە هەیە.
بیست ساڵ لەمەوبەر هاربێرت رید لە لێدوانەکانیدا کە بۆ ئێزگەی ئینگلستانێی نووسیبوو باسی ئەمەی کردووە.
شایانی باسە ئەو بیروباوەڕانەی لەوێی دەربڕین، بوون بە بناغەی هەموو نووسینەکانی لەوە بەپاشتری.
من وەک رەخنەگرێک و مامۆستایەکی گەورە رێزی هاربێرت رید دەگرم و بیرورایەکانیشی بەهەند هەڵدەگرم. بەڵام من دوای رابردنی ئەو ماوەیە دەڵێم کە بیرورایەکانی هاربێرت رید بە

گوێرەی مێژوو و هونەرەوە ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە و ئەمڕۆ چوونەتە خانەی کلاسیزمی سەدەی بیستەم. ئەمەش ڕێی ئەوەمان لێ دەگرێ کە لە تێگەیشتنی هونەردا پشتی پێ ببەستین.(*)
یان بیکەن بە بناغەیەک کە هونەرمەند و ڕەخنەگر کارەکەی لەسەر بنیات بنێ.
حەقیقەتی کاری هونەری و توێژینەوەی ئەو ڕەگەزانەی هونەرمەند لە داهێنانی وێنەکانیدا مامەڵەیان لەگەڵ دەکا، لە هەموو ئان و زەمان و شوێنێکدا جێگیرە و ناگۆڕێ. بەڵام شیکردنەوەی کاری هونەری و لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی، تا هەڵسەنگاندنی خودی هونەریش لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی تر و لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی دی و بەپێی گۆڕانی چەمکی مرۆڤایەتی و گۆڕانی رووکارەکانی بیروباوەڕەوە دەگۆڕێ، کە ئەمەش بە تەنیا بناغەی هونەر نییە بەڵکو بناغەی تەواوی کۆمەڵە.
واز لە هاربێرت رید دێنین و بەهەندیشی هەڵدەگرین، ئەمجارە

---

(*) ڕێبازی هاربرت رید لە ڕەخنەو لێکۆڵینەوەکانیدا دەربارەی هونەر، لە سەر شیکردنەوەی دەروونی و دیالێکتیک و تیوری بێرگسۆن و ئیستاتیکاوە وەستاوە.
تەبیعەت و سنوورێکی ڕەخنەیی ناسراویشی هەیەو شەفافیەتی خۆی پاراستووە، لەگەڵ ئەوەی ئادگارە سەرەکییەکانی بەیارمەتی چەمک و تیوری هەڵێنجراوی گەلێک بابەتی زانینەوەیە.
رید بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ هونەر دەکات، بەوەی کردەیەکی ئادەمیانەی فەرماندارە، زانای بایۆلۆژی و دەروونی و مێژوو تێیدەگەن.
بەپێی چەمکی رید، زانست روونکردنەوەی راستییەکانە، لەکاتێکدا هونەر ئەو راستییانە پێشان دەدا.
بڕوانە– **الاتجاهات الرئيسية في الفن الحديث في ضوء نظرية هاربرت ريد**–
وەرگێر

دێین ڕەخنەگرێکی دیکە وەردەگرین، کە لەگەڵ دەست و قەڵەم ڕەنگینی و توانستی یاریکردن بە وشەوە، بوونی ئەو ڕەخنەگرە لە ئینگلستان کۆسپێکی ڕێگای هونەر بوو.

ئەو ڕەخنەگرە (روسیکن)[28] بوو، کە بیروباوەڕەکانی تەواوی بێ بزاڤی و وەستاویی سەردەمی ڤیکتۆری بەخۆوە گرتبوو، جا ئەگەر بیروڕای ئەو ڕەخنەگرە لای ئینگلیزان شتێ بێ، ئەوا بە گوێرەی هونەر و مرۆڤایەتییەوە لەوان شتانە بوو کە ناکرێ وەک چەند مەسەلەیەکی باوەڕپێکراو یا چەند یاسایەکی نەمر وەربگیرێن، یاخود وەک هەڵگری بەرنامەیەک لە بەرنامەکانی ڕەخنە بژمێردرێ.

بەڵام لە فەرەنسادا دەبینین نووسینەکانی ئۆزنفان و مالرۆ[29] کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەنگیان دایەوە، زۆریان نەمابوو کۆن بن.

ئەمڕۆکە بایەخدانی هونەرمەند لەو شتانەدا ناچێتە دەرەوە کە جاران لەو دیوی هەوڵە بەردەوامەکانی دابوو لە لاساییکردنەوەی سرووشتدا.

هەرچی چۆنێکە ئێمە جیاجیا لە ڕەگەزەکانی پێکهاتەی هونەری نادوێین، کە هاربێرت رید و هیتر وایان کرد، دیسان ئەوەندەش تەمومژاوی نابین وەکو ڕەخنەگرە تازەکانی هونەر.

... بەڵکو لە پنتی ململانێی دژەکانی نێو کاری هونەرییەوە دەست پێدەکەین، ئەمەش نە هاربێرت رید و نە هی تر باسیان کردووە، تەنیا ئەو وەختە نەبێ کە لە ساوی وێنە دواون، ئەویش هەر بەچەند دێرێک و بەس.

گرنگی ئەو هۆو کارەش لە هونەرمەند خۆی و هەندێ ڕەخنەگرەوە

بتـــرازێ کـــه هونەریان کـــردووه به پیـــشـــه کـــەسی دی به هەندی هەڵناگرێ.

با له پنتێکی ساده و له هەمان کاتدا قووڵەوه دەست پێ بکەین، ئەویش ئەوەیه هەر کـــارێکی هونەری ژیانێکی تایبـەت به خـــۆی هەیه که لەکاری دیکەی جیا دەکاتەوه، ژیانێک که له ملـملانێی نێـوان رەگـەزەکـانی پێکهاتنی یەک له نێـو ئەوی دی و نێـوان ئەو رووەی وێنەی لەسەر کێشراوه.

کـــه لەو ملـمـــلانێـــیـــەش دەدوێین، ئەوا هەمـــوو ئەو رەگـــەزانه وەردەگرین کەوا کاری هونەری بنیات دەنێن.

●



**وێنە(142) هونەرمەند ڤان کوخ**

## دەروازەیەک بۆ ڕەگەزی ململانێ
## لەکاری هونەریدا

هەر کارێکی هونەری چەمکێکی دەروونی سەربەخۆی تێدایە، قەوارەیەکە بەهۆی سرووشی هونەرمەند و نزیکبوونەوەی لە شتی نادیار و، بڕوا بەخۆبوونیەوە بنیات دەنرێ، هەروەها وەک (مرۆڤێک)ی عاشق بە ژیان، ململانێی ئەو هەستە جیاوازانەشە کە لە ناخیدا دەبن بە هۆی بەیەکداچوونی ناکۆکەکانی نێو کاری هونەری.

ئادەمیزادی پێشین بۆچی وێنەی کێشا؟ منداڵ بۆ وێنە دەکێشێ؟ ئەدی هونەرمەند لە پای چی؟

منداڵ ڕۆژێ لە ڕۆژان کە دەزانێ بریندار کرا یا بێ دڵی کرا، لە کاغەز و قەڵەم بەدەر هیچ لە پێش خۆیدا نابینێ.

هونەر دەرمانی برینێکە کە بەردەوام خوێنی لەبەر بڕوا، ئەدی برینی پیاوی پێشین هەمیشە سەبارەت بە گیانلەبەرە

شیردەرەکانەوە خوێنی لەبەر نەڕۆیوە، کە دیواری ئەشکەوتانی نەخشاندووە؟ جا یا ئەوەتا راوی ناون یان راویان ناوە. ئێستا ئەو گیانلەبەرە شیردەرانە نەماون مرۆڤ لێیان بترسێ، کەچی لە نیگارکێشانیشدا بەردەوامە.. ململانێی نوێ دەبێتەوە. ئێستا لە ئاژەڵە شیردەرەکان دڕندەتر هەیە کە گەف لە ئازادی و ئاسوودەیی دەکا، هێشتا مرۆڤ لە شتە نادیارەکە دەترسێ و هێشتاکە بۆ گەیشتن بە لوتکە هەر لە ململانێ دایە، لەگەڵ ئەوەی شێوە و فۆرمی جیاجیای وەرگرتووە، تەواو وەک جیاوازی شێوەکانی هونەر.

هەر کارێک لە پێکهاتنیدا ململانێ و جوولانەوەیەکی تێدایە کە زیندەگی تایبەت بەو کارەی پێ بنیات دەنرێ، جا ئەگەر وا رێککەوت هەستمان بەو زیندەگییە نەکرد لە کارێکی هونەریدا، ئەوە مانای وایە هونەرمەندەکە شارەزایی و بەهرەی بایی ئەوەندە نییە بتوانێ ژیانێک لەسەر رووی تابلۆکەیدا دروست بکا.
ئەوەی راستیش بێ زیندوویی ئەو رووە لە ئەنجامی هەموو ئەو ململانێ جیاجیایانەی هونەرمەندە، چونکە هەڵچوون هەمیشە بە دوای هۆی دەربڕیندا دەگەڕێ، هەر هەڵچوونیشە قاوخی شێوەکاریی کاری هونەری دەستنیشان دەکا. وەک ئەوەی ژیانیش بنەماکانی دەداتێ.

کاتێ ئێمە لەگەڵ وێنەیەکدا دێینەوە. ئەوە دەگەیەنێ چاومان لە پێک بەستنی هێڵ و رەنگ و رووبەر و بارستە کێشراوەکاندا سەرەڕۆ نەبووە، بەو ژیانەی بەستۆتەوە کە بە هەموو کێشە و

ململانێیەکی تێدا دەژین، چونکە ئەو شێوەیەی حەقیقەتەکەی ڕەنگ دەداتەوە، ئێمە لە خەیاڵی خۆماندا رایدەماڵین و دەیخەینەوە سەر چەند بەهایەکی ئەبستراکتیەوە. ئەوانەی ئەبستراکت ئامێزیش کێشراون دەیگەڕێننەوە سەر ئەو حەقیقەتەی پێی راهاتووین، بە واتایەکی تر کاری هونەری هەستی جیاوازمان لەناخدا دەورووژێنێ، وەک دڵتەنگی و ئاسوودەیی و توندوتیژی و خاوبوونەوەو ئارامی. هەروەها هەمان ئەو هەستانەشمان تێدا زیندوو دەکاتەوە کە هونەرمەند لە داهێنانی کارە هونەرییەکەیدا بەسەریاندا زاڵ دەبێ.

(چالاکی) رۆژانەشمان پڕن لەو هەڵچوونانەی کاری هونەرمەند دیاری دەکەن. ئێمە بە هۆی ئەو پێوەرانەش توانیمان جۆر و پلەی ئەو هەڵچوونانە دیاری بکەین. ئەو پێوەرانەی بەرەنجامی ژیانی بەردرێژی مرۆڤ و ململانێکانی بووە، ئیتر تووشی چەشنەها هەڵچوونمان دەکا، لە تووڕەبوونەوە تا دەگاتە نەویستی و چەپاندن، وای لێکردووین مانا و سنوورێک بۆ ئەو هەستە جیاجیایانە دەستنیشان بکەین، جا لەگەڵ بینینی وێنەیەکدا چاوەکانمان نموونەی هەمان ئەو هەستانەمان بۆ رەنگ دەدەنەوە، بۆ نموونە لە بینینی چڵە رووەکێکی ئەم سرووشتە لەوانەیە لەبەرابەریدا هەستمان بە وردەکاری و سیستەمێکی مەحکەم کردبێ. بەڵام کە هونەرمەندێک بێت و وێنەی ئەم چڵە بکێشێ ئەو کاتە شۆڕشێکی توندوتیژ دیاری دەکا و لە وێنەکەیدا هەست بە هەڵچوون نەبێ بە چیتر ناکەین، لەگەڵ ئەوەی پێکهاتنی کارە هونەرییەکەی لەسەر چەند پەیوەندییەکی شێوەداری ورد و

سیستەمێکی ئەندازەیی پتەوەوە دادەمەزرێ.
بەهرە و توانا و وەستاکاریی هونەرمەند کە لە ڕێی ئەتەمی تابلۆکەدا تەنگ و چەڵەمەی هونەرمەندمان بۆ ڕەنگ دەداتەوە کە تێی کەوتووە، هەروەها ئەو هەڵوێستەی وەری دەگرێ.
لەوانەیە چەند پنجەگیایەکی تازە شین بوو، هەستی ئاژاوەیەکی تەواومان لەلا دا دروست بکا، ئا ئەم ئاژاوەیە دەبێ بە سیستەم و سەقامگیرییەکی خرگرەوە لەسەر رووی ئەو تابلۆیەی هونەرمەندێک بە چاوی نوقاوەوە بۆمانی دەکێشێ.
ئاپۆرەی سەر ڕێگا و تەکانی ئۆتۆمبێلان شلەژانێکی زەینیمان بۆ ڕەنگ دەدەنەوە کە بەهۆی گیروگرفتەکانمانەوە لە دونیای خۆماندا پێوەی دەناڵێنین.

بەڵام ئەگەر هاتوو هونەرمەندێکی بەختیار لە ژیاندا وێنەی ئەو دیمەنەی بۆ کێشاین، ئەوا تابلۆکەی گۆرانییەکی خۆشئاوازە و هونەرمەند بەختیاریی خۆی تیادا بەهەمووان رادەگەیەنێ.
کەواتە زمانی شێوە لەگەڵ ئەوەی بەپێی سرووشت و یاساکانی ژیانەوە بنیات دەنرێ، بەڵام بەو پەیوەندییە ساکارەوە بە دونیای بینراوەوە پەیوەند نییە کە هەندێ کەس لێی بەسەهو دەچن.
لەگەڵ ئەوەی هەستەکانیشمان کەم و دیاری کراون، بەڵام ئەوەی لەو ڕێگایەوە هەستی پێدەکەین بێ سنوورە.
کە چاویشمان لە رووبەری وێنەیەک دەخشێ مانای وایە بارگەیەکی هەستدار، خۆی لە پێکهاتەی هەستداری ناوەوەمان دەخشێنێ، تا بەوە بگەین کە ئەو هەڵچوونە جۆراوجۆرانە چیمان پێ دەکەن.لەو بارەدا ئێمە هەر بەتەنیا هێڵ و ڕەنگەکان نابینین،

بەڵکو بۆن و بەرامەشی دەکەین، گوێمان لە دەنگیشی دەبێ و هەست بە بەرزی و نزمی وگەرمیشی دەکەین، ئەمەش زیندوویەتی و نهێنی و فەرمان و نرخی خۆی بە هونەر دەدا.
بەبێ راستگۆیی و دڵسۆزیی و قووڵیی ئەزموون و تاقیکردنەوە، هونەرمەند لە گواستنەوەی هەر هەستێک بۆمان دەستەوەستانە، دیسان کارە هونەرییەکەش رەگەزە تەواوکارییەکانی لەدەست دەدا، ئەوەی کە بە هۆی ململانێی ناکۆکەکانەوە دەربڕاوە. ئەتەمی تابلۆش زیندەگی ئەو ململانێیە لەدەست دەدا کە لە ئەنجامی ململانێی هونەرمەند و ماددە خاوەکەی پەیدا بووە. چونکە تەواوی رەگەزەکانی تابلۆ لە هێڵ و رەنگ و بارستەکانەوە، دەبێ لە بۆتەی داهێناندا بتوێنەوە، تاکو ببن بە وزەیەکی خرۆشاو کە ئەویش بە دەوری خۆی ئاواز و ئاهەنگمان بۆ دەردەخا، ئێمەش لەسەر رووبەری وێنە کێشراوەکەدا بەدوایدا دەچین.
هەندێ جار رووکارەکانی جوولانەوە لەسەر رووبەرە کێشراوەکەدا دیار و سادەن، هەندێ جاریش ئاڵۆز و تێکچرژاون، کەچی جاری وا هەیە کاری هەندێ لە هونەرمەندە (ئەبستراکت)ـەکان، ئەوانەی لەو باوەڕەدان جێ فڵچە یا پەڵەی رەنگ، رووکاری جوولانەوەکە دیاری دەکەن.
رەگەزی ململانێش لەنێو ئەو رەگەزانە دایە کە شێوە پێک دێنن و بایەخێکی زۆریشی هەیە، بەبێ ئەو رەگەزەش ئێمە هەرگیز لەگەڵ کاری هونەریدا ناگەینەوەیەک، ئەو رەگەزە ئیکسیری کاری هونەرییە، توخمەکانی شێوە لە نێو یەکتردا دەتوێنەوە تاکو ئەو رەگەزە پێک بهێنن بۆ دیاریکردنی فەرمان و زیندەگی

ڕەگەزەکانی شێوە بۆ ئەوەی یاسا و پەیوەندییە وردەکان بنیات بنێ، کە ئەویش بەدەوری خۆی دووبارە دەتبەنەوە سەر ژیانی کاری هونەری و، هونەر و ناهونەریش لێک جیا دەکەنەوە.
ئەمەش لە ئاکامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی بەردرێژی هونەرمەند و، ژیانی لەگەڵ کارە هونەرییەکەیدا دروست دەبێ، بەرەنجامی ئەو ململانێیە قووڵە و ئەو پەیوەندییە گشتی و لاوەکیانەی هونەرمەند بە ژیان و بەو کۆمەڵەی تێیدا دەژی، ئەو پەیوەندییانەش هونەرمەند بۆمانی پێک دێنێ، ئێمەش دەم و دەست هەست بە پەیوەندی نێوان خۆمان و کارە هونەرییەکە دەکەین.
جار هەیە هونەرمەند ئاگاداری مەسەلەکەیە، جاریش وایە لە ئەنجامی هەڵچوونێکی تەماتیکییەوەیە. بەڵام پێویستە هەمیشە بە چەشنێکی دروستکراو نەبێ.

●



وێنە(144)
هونەرمەند هارتنج.



**وێنە(145)**
**وێنەیەک لە دەسکردی هونەرمەند جوان گرای.**

# هێڵ و بۆشایی

هەندێ جار هەست بە خۆشی و دڵنیابوونێک دەکەم بەوەی نیگارکێشم، لە خەمی ئەوانەشدا دەبم لە بوارەکانی تردا کار دەکەن، وەک مۆسیقازان و ئەندازیار و بیناساز و نووسەرانی شانۆ، لە خەمی ئەوانە دام کە بەرهەمەکانیان هەمیشە پێویستی بەکەسێ هەیە پەیمانی رابگەیەنێ، ئەوانەی وشەکانیان بە زیندانی و خنکاوی دەمێنێتەوە تا ئەوەی یەکێک دێ بە زیندوویی و بریقەداری وەک پێویستە رایدەگەیەنێ.

بیرم لەو مەسەلەیە دەکردەوە لەکاتێکدا گوێم بۆ قەسیدەکەی ئیدگارئالان پۆ – زەنگەکان- رادێرابوو کە چووبووە دڵی – بۆدلێر–ی شاعیر و وەریگێڕابوو، ئەوەتا خاتوو (ماری مارکیێ)ی مەزنیش دەیخوێنێتەوە.

قەسیدەکە لەخۆیدا لەشاکارە مەزنەکانە، وەستایی و دەست

ڕەنگینی بۆدلێر و زاڵبوونی بەسەر مۆسیقای زمانی فەرەنسیش وای لێکردبوو ببێ بە لوتکەیەکی بەرزی نێو لوتکەی تری شیعرە نەمرەکان، بەڵام ئەوەی ماری مارکیە لە دەربڕینی ئەم قەسیدەیەدا کردی هەر مەپرسە. شتێک بوو ناتوانی لە قاوخی هونەریش دابنرێ، پیاو لە بەرابەریدا دۆش دادەمێنێ، شیعرە؟ مۆسیقایە؟ دەربڕینە؟ شێوەکارییە؟ ئیدی هەر بەو چەشنە پرسیار بە دوای پرسیار و ئایا بە دوای ئایا دا دێ...
وشەکان ئاهەنگاوی دەنگ دەدەنەوە تا لە بۆشایی ژوورەکەدا کۆدەبنەوە و بەسەرتدا زاڵ دەبن و پەلت دەگرن لە سنووری هونەر بتەبەنە دەرێ، لە سنووری شوێنکاتدا.. ئیتر هەر ئەوەندە خۆت دەبینیەوە بووی بە بەشێک لە دەربڕینی ماری مارکیە و وشەکانیش بەشێکن لەتۆ..
(ماری مارکیە) تەواو دەبێ کەچی هێشتا وشەکان لە بۆشایی هۆڵەکە دان و زایەڵەیان لە گوێت دەزرنگێنەوە و پێکهاتنی مۆسیقییان کار لە ناخت دەکەن.

ئەفسانەیەکی گریکی هەیە دەڵێ: (وشەکان لەسەرمان بوون بە شەختە و هەروا بە ڕاگیراوی لە هەوادا مانەوە). وەکی دی لەو بارەی کە باسمان کرد، گەرم وگوڕی ماری مارکیە وشەکانی لە بۆشاییدا ڕاگرتن و توانی لە نرخی ئەو شیعرە نەمرە چەند جار و چەند جاری بەهای هەست پێکراوی بە گوێرەی خوێنەر زیاد بکات، تەنانەت لەبەرابەر ئەم دەربڕینەدا لەخۆم دەپرسم داخۆ کامەیان مەزنترن، ئیدگار ئالان پۆ؟ یان بۆدلێر؟ یاخود ماری مارکیە؟

ئەگەر هەوڵمان دا لێی بکۆڵینەوە و بەدوای زانینی ئەو ئادگارانە بگەڕێین، کە ئەو توانایەی دایە ماری مارکیە، بەهای ئەو پارچە شیعرە بەدوا پلەی بگەیەنێ، ئەوە دەگەینە ئەوەی ئەو ئافرەتە مەزنە بەتەنیا بەهرەی نواندنی درامی- شانۆیی نییە و بەس، بەڵکو توانایەکی خرۆشاویشی هەیە لە راگەیاندنی وشەی نووسراو بۆ تەواوی ژیان. ماری مارکیە یاری بە پلە و بەرزیی نزمیی دەنگیەوە دەکا وەک چۆن قۆشمەچییەک یاری بەشتان دەکا: ئەو توانایەکی وای هەیە وشەکە بە چەشنێک دەربڕێ کە مۆسیقای لەگەڵ چەمک و واتاکەی بێتەوە، بە جۆرێک توانای لە رازاندنەوەی وشە لە دەربڕیندا بە هەموو بەهایەکی شێوەکارییەوە دەگاتە ئەوپەڕی. بەڵام با لێرەدا بزانین مەبەست لە (بەهای شێوەکاری)وشەدا چییە؟ داخۆ دەبێ وشە کێش و قاوخ و پلەو بوارێکی هەبێ تیای بجوولێتەوە، یا سنوور و رووخسارێکی هەبێ؟

بەڵێ! مرۆ لەگەڵ ماری مارکیەدا هەست بەوانە گشتی دەکا و وشەکانیش هەروا بە راگیراوی لە بۆشاییدا دەمێننەوەو لە گوێتدا دەزرنگێنەوە.

دەنگ بە ناو بێدەنگیدا تێدەپەڕێ، یان دەشکێتەوە، تەواو وەک ئەوەی هێڵ بە بۆشاییدا دەڕوا بۆ ئەوەی وێنەکەمان لەلا روون بێتەوە، واز لە ماری مارکیە دێنین و دەچینە سەر نموونەیەکی تر: ئێمە ئەوە دەزانین، مۆسیقاژەن لە کاتی مۆسیقا لێداندا خۆی بە دەقی رستەی نووسراوی مۆسیقاییەوە دەبەستێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شێوەی دەربڕینی مۆسیقاژەنەکان جیاواز دەبن، بەمجۆرە

دەتوانین بڵێین مۆسیقاژەنێک لەوەکەی دی پارچە مۆسیقاکە باشتر لێ دەدا، یان بۆ لێدانی ئاوازی دیکە چاکە، یا لەوانی دی زیاتر تاقەتی بەسەر وەرگێڕانی مۆسیقای قۆناخێکی دیاریکراودا دەشکێ.
با گوێ بۆ ئامێرێکی مۆسیقا رابدێرین، با بڵێین (چەلۆ) بێ، ئێمە زەین دەدەینێ، ئاوازەکە بە نەرمیەکەوە تێدەپەڕێ، بەرز و نزم دەبێتەوە، وەک دەربڕینەکانی مۆسیقازانی فەرەنسی (نیڤارا) یا هەڵپە دەکا و دەشکێتەوە، وەک دەربڕینی (میناردی) ئیتاڵیایی.

هەر بەو چەشنەش هێڵ دێت و نەرمۆکە لە بۆشاییدا دەچەمێتەوە، یا تەکان دەخوا و بۆ بڕینی بۆشاییەکە لار دەبێتەوە. جا ئەگەر بە وردی گوێ رادێرین، هەست دەکەین دەربڕینی (نیڤارا) بەهۆی پەیوەندییەکی کاتییەوە دیاری دەکرێ، ئەو پەیوەندییەی لە نێوان پلە بەرز و نزمەکاندایە، ئا ئەو پەیوەندییە کاتداریشە ئاهەنگ لەو هێڵەدا دیاری دەکا کە نەرمۆکە و ئازاد تێدەپەڕێ، چونکە ئاهەنگ لەم چەشنە هێڵانەدا بە پەیوەندی بەینی بەشە بەرز و نزمەکانییەوە دەستنیشان دەکرێ.

بەڵام بە گوێرەی (میناردی)، ئەوەی دەربڕین دیاری دەکا ئەو ساتانەیە تیایدا دەوەستێ تا جارێکی تر دەست بە ئاوازەکە بکاتەوە، تەواو وەک ئەو پەیوەندییەی پنتەکانی راگیربوون لە هێڵی شکاوەدا جۆری ئاهەنگەکە دیاری دەکەن، کەواتە وەک چۆن ئاوازەکە رادەبوورێ، هێڵەکەیش هەر بەو چەشنە

بەسۆزێکەوە لار دەبێتەوە، یا بە توندی و تیژییەوە دەشکێتەوە، ئینجا دەوەستێ تا جارێکی دی تەکان بداتەوە. جارێ لەسەرخۆ و بە ئەسپایی بەسەر رووی کاغەزەکەوە، وێنەی ئاوازێکی ئەفسووناوی تێدەپەڕێ. جارێکیش بە هەڵپە و شەپۆلاوی، وەک شەپۆلی هەڵچوو تەکان دەدا، چەندی هێڵەکەش لە جوولانەوەیدا بەگوڕ و بە جۆش و زیندوو بێ و ژیانی تێدا بێ، ئەوەندە لە سنووری کاغەزە پانەکەمان دەباتە دەرەوە، بەواتا لە هەردوولای کاغەزەکە- درێژی و پانی- بەم جۆرە کاغەزەکە دەبێ بە بۆشاییەکی دوایی نەهاتوو، هێڵەکانیش جیهانێکن بەناویدا دەسووڕێنەوە.

خۆی لە راستیشدا بینەر بێ ئەوەی هەستی پێ بکا چاوی لەگەڵ هێڵەکەدا دەسووڕێنەوەو پەیوەندی و بەرزی و نزمیەکانی، وەستان و جوولانەوەی، تەکاندان و ئەو پنتە راگیربووانەی تیایەتی، لێ دەدۆزێتەوە و بە کورتی چاوی پێدا دەخشێنێ، ئاهەنگ و ئاوازی تیا دەدۆزێتەوە، ئینجا دەگاتە ئەوەی بڕیاری ئەوە بدا داخۆ پەیوەندییە هێڵ ئامێزەکان تەبان یان نا؟
ئێمەش کاتێک دەڵێین هێڵ، مانای وایە مەبەستمان لە هەموو چەشنە هێڵێکە، چ راست، چ چەماوە، یا چ راست رێ بکا یاخود تیژ و شکاوە بێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هێڵەکان لە دابەشکردنی جیاجیایاندا یەک لەوەکەی دی دەکرێنەوە، چونکە پەیوەندییە جیاجیاکانی هێڵ لەگەڵ یەکتریدا پێکهاتەی شێوەکاری پێک دێنن و دیاری دەکەن.
هەرچی چۆنێکە پێویستە وەک رووکاری هێزەکان وەربگیرێن کە

لە چەند پنتــێکدا تێک دەپەڕن، ئەو پنتــانەش نرخ و بەهای خۆیانیان هەیە.

بۆ نموونە ئەو هێڵانەی بە گۆشەی وەستاوەوە شاوڵ دەبن، بارێکی لەنگەرگرتوو دروست دەکەن، بەڵام ئەو هێڵانەی لار دەبنەوە وەک ئەوەی لەبەر یەکتری وەستابن، یا دژ بە هەر چوارلای وێنەکە بن، سەیر دەکەین رووبەری نوێنراومان بۆ دابەش دەکەنە سەر چەند رووبەرێکی قیناج کە لە بەرامبەر و لە یەکتری لاتەریک دەبن. ئەوەش هەمیشە هەستی جوولانەوەمان پێ دەبەخشێ، وەک بڵێی کاغەزە جێگیرەکە بۆشاییەک بێ ئەو هێڵانەی تێدا بجوولێتەوە و هاتووچۆی تێدا بکەن. پلیکانەیی هێڵەکانیش لە بەرزییەوە بۆ نزمی و بە پێچەوانەش لە ناوەوە و دەرەوەی بۆشاییەکەدا- مەبەستمان لە بۆشایی کاغەزەکەیە- کە هەستی لێچوونەوەی قەبارەکانی نێو وێنەکەمان دەداتێ، هەروەها تەکاندانیشی بەرەوڕوومان، لە دەرەوەی چوارچێوەی وێنەکەدا.

کە نیگارکێش دەست لەسەر کاغەزی سپی دادەنێ وێنە بکێشێ، مانای وایە ئەو وەختە رووبەری سپیی کاغەزەکە دەبینێ. بە روانینێکی نوێ و رێگایەکی دیکەشەوە کاغەزی سپی بە گوێرەی ئەو دەبێ بە بۆشاییەکی سپی کە دەتوانرێ گوزەری تێدا بکرێ، لە کاغەزێکی پان و پاگژەوە دەبێ بە بۆشاییەکی بەتاڵ. دونیایەک تیشکی تەڵخ کە شتەکانی تێدا دەجوولێنەوە، بەڵام ناتوانین هیچ شتێکی ئەودیوی ببینین.

نیگارکێشیش کە هێڵێک لەسەر ئەم رووبەردا یان راستتر لەنێو ئەو بۆشاییەدا دەکێشێ دەزانێ ئەو بۆشاییە دەبڕێ و بەناویدا تێدەپەڕێ، باش باش دەزانێ کە دەبێ دەستی بەسەر هێڵەکەدا بشکێ و تەنگەتاوی بکا، نەک وەک شۆفێری ئۆتۆمبێلێ کەتەنیا بە چوار لایاندا لێ دەخوڕێ، بەلای پێشەوە و پاشەوە و راست و چەپ، بەڵکو وەک فڕۆکەوانێک کە لە ئاسماندا دەسووڕێتەوە، بە بەرزی و نزمی و بە هەموو لایەکدا، لەم بارەدا هێڵ پنتێکە لە بواری بۆشاییدا دەردەپەڕێ.

ئەو نیگارانەش کە تەنیا لە هەستکردن بە رووبەرێکی پانەوە زیاترمان ناداتێ هەژارتر و کەم بایەخ و کەم بەهاترن لەو نیگارانەی لە پێشیاندا هەست بە گوڕی هێڵەکانی نێو بۆشاییان دەکەین کە چۆن گوزەری پێدا دەکەن.

هەست بە بۆشایی و مەودای شتان کردنیش مەسەلەیەکی گرنگە نەک بە تەنیا بۆ هونەری وێنەکێشان بەڵکو بۆ هەموو جۆرە نیگارکێشانێکیشەوە. جا ئەو وێنەیە وێنەیەکی ئەبستراکتی بێ، یان راستییەکی بینراو دەرببڕێ، هیچ چار نییە دەبێ هەست بە بۆشایی و ئەو رووکارانە بکەین کە لە بۆشاییدا دەخولێنەوە، لەرێی هەست بە بۆشایی کردنیشمانەوە، هەست بەلایەنی پتەوی (بوون) دەکەین، هەست بە قەبارە و مەودایان دەکەین، لەگەڵ زێدەبوونی شارەزاییە هەستییەکانیشماندا، هەست بە جیاوازییەکان دەکەین هەم لەمانا و هەم لە ژیانیشدا.

کاتێ هونەرمەند دەڕوانێتە پیاوێکی دانیشتووی بەرامبەری، بە چاوی خوێندکارێکی هونەر سەیری ناکا کە دەیەوێ ڕێژەو جوولانەوەی پیاوەکە بە شێوەیەکی هەروایی بگوێزێتەوەو هیچی تر. نەخێر ئەو تێیەوە رادەمێنێ راستییەکی سادە و لە هەمانکاتیشدا قوولّی لە مێشکدایە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم پیاوە قەوارەیەکی پتەوە و بۆشاییەک پڕ دەکاتەوە، هەروەها دەجوولێتەوە و شیاوی گۆڕانەو پابەندی ئەو هەلومەرجەیە کە دەورەیان داوە و دەشتوانێ بیانگۆڕێ. بەم جۆرە ئەو پیاوە سایلی هەموو راستییەکی دیکە، لە روویەک پتری هەیە، جا چەندی هونەرمەند لە گواستنەوەی شتەکانی بەردەمی و خولّقاندنی ژیان لەسەر رووی کاغەزەکەدا راستگۆو دڵسۆز بێ زیاتر لە روویەکی راستییەکەمان بۆ دەرنابڕێ، چاکیش دەزانێ ئەوەی لە بۆشایی کاغەزە سپییەکەدا بۆمانی دادەهێنێ، بەرادەیەکی زۆر خودی خۆیمان بۆ دەردەبڕێ- واتە خودی هونەرمەند- تەواو وەکو ئەوەی لە هەمان کاتدا پیاوە وێنە کێشراوەکە دەردەبڕێ، دەشزانێ بە ململانێی بۆ داهێنانی قەوارەی بەردەمی و بەرجەستەکردنی لەسەر کاغەز، بەرە بەرە لەکاتی نیگارکێشاندا لە نموونەکەی بەردەمی نزیک دەبێتەوە- کە پیاوەکە-یە تا وای لێدێ خۆی و ئەوەی وێنەشی دەکێشێ دەبنەوە یەک.

هونەرمەند خۆشی لە بواری ئەو تیشکە تەڵخەدا- مەبەستم لە سپیایی کاغەزەکەیە- دەست پێدەکا، ئەوەی کە دەگری و دەکەوێتە گۆرانی و سەما و هات و هاوار هونەرمەندەکەیە، نەک هێڵەکان.

هونەرمەند لە داهێناندا هەست بە کێشەی خۆی دەکا، وەک بڵێی

ئەو نموونەیەی دەیخاتە سەر کاغەز لەناخی ناخەوەی دابووە.

ئیتر ئەو هێلانەش سنووری ئەو شتانە دەرنابڕن کە دەیانبینێ بەقەد ئەوەی راستی ئەو سنوورە دەردەبڕن کە هونەرمەند بەهۆی هەڵچوونەکانییەوە پێی گەیشتووە.

●



وێنە(146)
دەستێک و پەرداخێک لەودیوی میناوە – فۆتۆگراف.



**وێنە(147)**
**ڕووی ساختمانێکی سەدەی بیستەم.**



هونەرمەند خوان میرۆ.



هونەرمەند ئێدوارد مۆنێ.

## ساوی بۆشایی و رووەکان(*)

درەنگی ئێواران مرۆ بەرەو ماڵ دێتەوە، کە دەشگەڕێتەوە هەست بە تەنیایی دەکا، (با) بێ هەست و خوستە.. هەوا گەرمۆکەیە، باسکان لێ درێژدەکا و پەنجەکانی لێک دەکشێتەوە. هەست بە هیچ ناکا، دەستی بە توندی وێک دێنێتەوە تا هەست بە وێک هاتنەوەی پەنجەکانی دەکا، هەست بە لێک سووانی پەنجە و بە گەرمایی دەستەکانی دەکا.

لە دیواری ماڵان نزیک دەبێتەوە... بە تەنیشتیاندا دەڕوا.. دەڕوا لە بێدەنگی و رەشداگەڕاویی دیواردا هەست بە دڵنیابوونێک بکا. پەنجەی هەڵدەبڕێ و هەر دیوارێکی دەیگاتێ پێی دادێنێ...

---

(*) (ساو)م لە باتی (ملمس) بەکارهێناوە، ئەم وشەیەش لە کوردیدا بەکار دێ، دەڵێن ساوی فلانە شت زبرە.. یا نەرمە.. تاد. وەرگێڕ.

دیوارێ لووس و لێک، دیوارێ کۆن و خوراو، دیوارێ سەرمای شەو کاری تێکردووە، دیوارێکیش هێشتا گەرمایی ڕۆژی پێوە ماوە.. دیوارێ خاوو یەکێ پتەو..
دەگاتە ماڵەوە، دەرگا بەدوای خۆی دادەخا.. ئیتر هەست بە تەنیایی ناکا، ئەو ئێستاکە هەست بە شتێکی دی دەکا، هەست بە گەرمایی شوێنەکە دەکا، میلی رادیۆ بادەدا بەڵکو شتێک بدۆزێتەوە شایانی گوێ لێگرتن بێ، دەنگی گۆرانیبێژێکی دێتە بەر گوێ، دڵشاد دەبێ، چونکە ساوی دەنگ وای لێدەکا هەست بە دڵنیابوون بکا.

مرۆڤ دەستی بەناو هەوادا درێژ دەکا، هەست بە بۆشاییەک دەکا، بەمەش دڵخۆش دەبێ، دیسان بەوەش شاد دەبێ ئەگەر بێتو دەستی درێژ بکا و هەستی پێ بە شتان بکا. هەست بە زبری خوری و نەرمیی ئاوریشم، بە ڕەقی بەرد و شلیی ئاو، بە ساردیی بەفر و گەرمی کوپە چایەک.
هۆشی دەروون هەموو شارەزاییەکانی پێش هەستی (بەرکەوتن-لمس) دەپارێزێ و بەشتی دیکە و شارەزایی هەستی تری دەبەستێتەوە، پاشان بە نرخە رووت و ڕەهاکانیش.

ئەگەر وا ڕێکەوت کەسێ کەوتە بەرامبەری کابرایەک، سەیر نییە کابرا بڕوانێتە هەڵسوکەوت و جوولانەوەی و تەماشای جل و بەرگی بکا و گوێ بۆ قسە وگفتوگۆی ڕادێرێ، ئینجا لەبەر خۆیەوە بڕیاری ئەوە بدا داخۆ ساوی ئەو کابرایەی لێ خۆش دێ یان نا.

ئێمە وشەی (بەرکەوتن-لمس)مان بە مەجاز بەکارهێناوە چونکە ئەو هەستە پەیوەندییەکی پتەوی بەژیانمانەوە هەیە.

بەم جۆرە کەدەڕوانینە وێنەیەک دەڵێین "ساوی ئەم وێنەیە تەواوی ململانێیەکانی هونەرمەندی تێدایە و گەرم وگوڕیی ژیانی لێ دەچکێ" یان دەڵێین "کاری ئەو هونەرمەندە ساوی تێدا نییە"، واتە لە کارەکەیدا وا دەگەیەنێ کە هونەرمەند لە لاسایی کەرەوەیەک زیاتر نییە، یان پیشەوەرێکە شتە ساوا و دووبارەبووەکان بەبێ ژانگرتن و کێشە و هیچ کۆششێکی نوێخوازی بەدوای راستییەک، یان رایەکی تایبەتی خۆی هەبێ دووپاتیان دەکاتەوە.

دەشێ ساوی رووی وێنە لە هەموو رەگەزێکی دیکەی ئەو رەگەزانەی کاری هونەری پێک دێنن گرنگتر بێ.
لە بازاڕە جیهانییەکانی وێنەدا، وێنە بە سانتیمەتر دەفرۆشرێ، پلەو ئاستی هونەرمەند بە نرخی سانتیمەتر لێک دەدرێتەوە، چونکە ئەتەم و ساوی وێنەکە و قووڵیی ژانەکانی هونەرمەند بۆ دۆزینەوەی روو گرنگتر و بەهێزترە لە بابەتە رەسمکراوەکە، دیسان لە توانایی و شارەزایی هونەرمەندیش بەهێزترە.
خەڵکی هەموو هەست بە جیاوازی روو دەکەن و ئەو ماددانە دەناسنەوە پییێ دروست دەکرێ.

لە قەراخی رووباردا تەماشا دەکەین منداڵان دەست لەبەرد و لم و چەو و ئاو دەسوون، لەلادێشدا هەر بەو جۆرە هەست بە کێڵگەی

کێڵراو و ساوی سواخی وشکەوەبووی دیواری ماڵەوە دەکەن.. لە هونەریشدا ململانێی هونەرمەند و قووڵیی ئەزموونە مرۆڤایەتی و هونەرییەکانی بەهایەک بە رووەکانی دەبەخشن.
رەگەزی (کات)یش لە ژیان و هۆیەکانی روونکردنەوە و هۆیە بایۆلۆژییەکان کە یارمەتی پێکهاتنی ماددەکەیان داوە، رووی شتەکان دەوڵەمەند دەکەن، ئێمەش کە بە پەنجەکانمان دەیگرین، لە بەرابەریدا هەست بە بەختیاری و بەمەیلێک دەکەین، مەیل و هۆگرییەک کە سەرەنجامی پەیوەندی مرۆڤە بەر لە هەزاران ساڵەوە بەو چەشنە ماددانە.

بەڵام سەدەی بیستەم هەر بە تەبیعەتی خۆی سەقامگرتوو نییە، جا سووربوونی ملوێنەها ئادەمیزاد لەسەر ژیان و پێداگرتنی بۆ مسۆگەرکردنی تەواوی پێویستییەکانی، ئەم سەدەیە ئەوەی بەسەردا سەپاندووە متمانەی تەواوی بە ئامێر و ئەو ماددە کیمیاییانە بێت کە دروستیان دەکا.

ئادەمیزاد لە دروستکردنی گەلێک ئامراز و شتی ترەوە پشتی پێ بەستووە کە لە ژیانی رۆژانەیدا بەکاریان دێنێ. ئەو ئامرازانە بەپێی پێکهاتنیان و هەروەها بەپێی ئەو ماددە خاوانەی تێیاندایە و ئەو پێداویستییانەی نەخشەی قاڵبەکە دەیسەپێنێ، زۆر جار لووس و لێک و لاڵ دەبن و سۆزی بۆ نابزوێ، چونکە نەخشەی ئەو ماددە دروستکراوانە وەک ماددەی (پلاستیک) ئاگاداری و بیرکردنەوەیەکی دووروبەردرێژی دەوێ تاکو مرۆڤ دەتوانێ ئەو ئامرازانەی لەو ماددە پیشەسازییانە دروست کراون

له باتی ئەو شتانە قبوڵ بکا کە لە دار و کانزاکانەوە دروستیان دەکـا. چەندی ئامـێـر و بەرهەمـەکـانی ئامـێـر بەسـەر ژیانی ئادەمیزاددا زاڵ بن، مرۆڤ زێتر غەریبی ئەو شتانە دەکا کە بە ماددە خاوەکانی سرووشت و بەدەست دروست دەکرێن.

لە ئەنجامی ئەو غەریبی کردنەشەوە، سەیر دەکەین هونەرمەند لە پێشوو زیاتر بایەخ بە (روو) و (ساو)ی وێنەکە دەدا، لەمەشدا مەبەستی ئەوەیە کە لە ساوی ماددە دروستکراوە لاڵەکانەوە دووری بخاتەوە. ئەو ماددانەی چی وای نەمابوو هونەرمەند هەر بە یەکجاری لەگەڵیاندا نەگونجێ.

دیسان هەستکردنی هونەرمەند بەبێن تەنگی لە شارەکانی سەدەی بیستەمدا وای لێکردووە هەست بە پتەوی - روو- و دیواران بکا. ئیتر وای لێهات شێوە و روخسارەکانی لە -روو- شدا دی نەک تەنیا لە رووبەر کە لە کۆندا وای دەکرد.

هەر لەیەکەمین هەوڵی ئادەمیزاد بۆ نیگارکێشان، ئەو مرۆڤە خۆی رووبەڕووی ئارەزووی خۆی بووەتەوە لە دروستکردنی بۆشاییدا. ئارەزووی گەیشتن بە دەربڕینی ئەو هەستەی بۆشایی لەلاماندا دروست دەکا. هەوڵ دەدا بۆشایی لەسەر روویەک پێک بێنێ کە لە دوو لای زیاتر نییە- درێژی و پانی(*) سووربوونیشی لەسەر ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی دەستمایەیەکی

* "لێرەدا مەبەستی لەوەیە کە مەودای سێیەمی نییە- وەرگێڕ"

لەبن نەهاتوومان لەشێوە هونەرییە جۆراوجۆرەکان بۆ بەجێ بێڵێ کە بە پێی کات و دەوروبەر لە گۆڕاندا بووە.
بەڵام لەگەڵ ئەوەی هونەرمەند تەواو دەستی بەسەر دروستکردنی قەوارە و رووبەر و مەودای شێوەکان شکاوە. خەونی هەمیشەیی بۆ دروستکردنی بۆشاییەک نەهاتە دی.

هەموو وێنەیەک دەتوانرێ بکرێ بە دوو بەشەوە: وێنەیەک کە دەمانگەیەنێتە ئەوەی هەست بە رووبەر بکەین، وێنەیەکی دیکەش تێیدا هەست بە -روو-یێکی قوولّ دەکەین کە بۆ نێو چوارچێوەی تابلۆیەکە پەلمان دەگرێ.
ئەم دابەشکردنەش رێی ئەوە ناگرێ، بەرهەمی وا هەبێ سیفەتی هەردوو بەشەکەی هەڵگرتبێ.

لە هەوڵی دڵسۆز و بەردەوامیدا بۆ دەربڕینی بۆشایی، هونەرمەندی سەدەی شازدەم گەیشتە ئەوەی، پەردەی سەر رووی نهێنی و تەلسمەکانی بینراو بدڕێنێ، ئیتر وای لێهات وێنە بە هۆی مەودای سێیەمەوە هەستمان وەبەر بێنێ بەڵام تا سەدەی بیستەم نەگەیشتە ئەوەی بۆشایی دەربڕێ.

بەم جۆرە هەستکردنی هونەرمەند بە هەناسەسواری و پەیدابوونی ئامێر و بەرهەمی لە ئەندازە بەدەر و مادده پیشەسازییەکان، هەستی ئەوەی وەبەر هونەرمەند هێنا کە پێویستی زیاتری بە بۆشایی هەیە و رکابەریشی لەگەڵ بەربەست و رووبەرەکان زێتر بووە.

هەربەمـــجـــۆرە، لە پاش ئەو هەمـــوو رووە دوور و بەردرێژانـەدا هونەرمەند توانی بەسەر گیروگرفتەکانی- پیشەی وێنەکێشـان- زاڵ ببـێت. ئەم زاڵبـوونەشی وای لێکرد لە دروسـتکردنی ئەو ئەتەمـەدا سـەرکـەوتوو بێت کـە بۆشـاییـمـان بۆ دەردەبڕێ، یاخـود رووە لە باڵ یەکـدەرهاتووەکـانی نێـو بۆشـایی، یا ئەو رووانەی ململانێـیـان لەگەڵ بۆشـاییـدا هەیە، یاخـود بۆشـاییـەک کـە بە نێوانیاندا دەخولێتەوە.

ئەم روانینە سـادەیەش هەڵـەیە و تـارمـایی و خـەیاڵـێکی باوە، دەدرێـتـــە بەر چەمکی ئەتەمی وێنە و ســـاوی رووی و دەڵـێ: زیادەڕۆیی لە زبری روو بەشێکە لە نیشانەکانی شێوەی هونەری نوێ و بەڵـگەیەکە گیانی سەردەم دەردەبڕێ.
لە ئەنجـامی ئەو هەڵـەیەدا وای لێـــهــات زۆربەی هونەرمــەندە لاوەکان و بۆرە هونەرمەند و هەلپەرستەکان لاسایی رووی وێنەی مـامۆسـتا مـەزنەکـان بکەنەوە، تەواو وەکـو جاران کـە پێشـەوەر و هونەرمـەندە بچـووکـەکـان لە رێبازی کـێشـانی وێنەی لۆچەکـانی قـومـاش و هەروەها لە کـێـشـانی وێنەی سـەروسیـمـا و دەسـتـدا لاسایی مامۆستا مەزنەکانیان دەکردەوە.

وێرانتریش ئەوە بوو، کـتێبـەکان بۆ بەدەست خستنی روویەک بۆ وێنە، بەڕێزکردنی چاکـترین رێگاو خێراترینیـەوە نەخشـێنراون، تەواو وەک ئەوەی بیـست سـاڵ لەمـەوبەر کـتـێـبـێک دەربارەی چۆنییەتی کێشانی وێنەی دەم و چاو یا کێشـانی وێنەی سەگێک دەنووسران.

لە راستیشدا کە هونەرمەند دەست بۆ فلچە زبرەکەی یا چەقۆیەکی وێنەکێشان دەبا هەویرێکی ئەستووریش دادەنێ ڕەنگەکان دەچنە باڵ یەک و ڕادەی ناکۆکیان وەک یەک نابێ، بەمەش هونەرمەند شۆڕشی کپکراوی دژ بە سەدەی بیستەم و لەترسی دەست بەسەرداگرتنی ئامێر و نەمانی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شتە خاوەکانی سرووشت رادەگەیەنێ و سۆزی خۆی بۆ ساوی ئەو شتە خاوانەی سرووشت دەردەبڕێ کە وایان لێهاتووە هەست بە ساویان ناکەین و هەروەها هەست بەوەش ناکەین کە ڕەگەزی کات و هۆکارەکانی رووتکردنەوە و داماڵین بەسەر روویدا دەیهێڵنەوە.

هونەرمەند لەگشت ساوێکی نەرم و ناڕەسەن وەڕس بووە، بۆیە بە شەوقەوە رووەو ساوی ڕەسەن و زبری ژیان دەچێ.
هونەرمەند کە دەست بۆ چەقۆیەکەی دەبا روویەکی ساف و لووسی پێ بڕوشێنێ، مەبەستی ئەوە نییە وەستایی خۆی، یان مۆدێکی نوێ پیشان بدا، بەقەد ئەوەی کە ئەو دڕییە یا لە باڵ یەک دەرهاتنە کاردانەوەیەکی سرووشتییە و جۆرە ناڕەزایی دەربڕینێکە دژ بە هەموو دیوارێکی دیار و نادیار، کە ئەم وای بۆ دەچێ لە تاودان و کاملکردنی خۆی دەیوەستێنێ. ئەو لە باڵ یەک دەرهاتن و رووشانەش تەماتیکی و خۆکار نییە.

ئەو ڕەنجە گەورەی هونەرمەند دەیدا، هەروەها وردکردنەوەی لە خستنەڕووی ئەو رووە رووشاو و لەباڵ یەک دەرهاتووانەدا، لە پابەندکردنی ئەو پەیوەندییە ئەندازەیی و مۆسیقاییانەدا کۆ

دەبێتەوە، بەم چەشنە دەبێ بە بەشێک لە پێکهاتەی تابلۆکە خۆیدا. ئا ئەو ژانەش هەرگیز لە ژانی هونەرمەندی دێرین کەمتر نییە لە کێشانی وێنەی ئەو تۆپەڵە ئادەمیانەی وێنەکەی پێ پڕ دەکردەوە، چونکە ژان و کێشەکانی هونەرمەند یەکە.
ئای کە ئەو لە باڵ یەک دەرهێنانەش بۆ هونەرمەندێکی ڕەسەن چەند ئەستەمە، بۆ لاسایی کەرەوەیەکی ناڕەسەنیش چەند ئاسانە.

ڕاستگۆترین نموونەش ئەو کارەیە کە فۆنتانای نیگارکێش پاداشتی (بینیالەی ڤینیسیا) (*) " لە ساڵی 1966 پێ وەرگرت. هونەرمەند لە چەند شەشپاڵوویەکی سپی وێنەی دیوارێکی گەچی خاوێن پیشان نەداین، بەڵکو لە نێوەڕاستی هەر شەشپاڵوویەک درزێکی تێکردبوو. بەم جۆرە چەند ڕوویەکی لە باڵ یەک دەرهاتوو و چەند دیوارێکی درز بردووی پێشان داین، بەمەش زۆری نەمابوو لە ڕوانینی (ڕۆبرت فرۆست)ی شاعیر نزیک بێتەوە لەو شیعرەی بەناوی (دیوار)ە و کە دەبێ دیوار چۆن بێت:

---

(*) biennale – بینالی– وشەیەکی لاتینییە بە مانای (لە دوو ساڵ جارێکدا) دێ. (بینالی ڤێنیسیا)یش دەتوانین بڵێین پێشانگایەکی سەرەکی هونەری شێوەکارییە کە لە بواری نێودەوڵەتاندا ساز دەکرێن. (بینالێ)یش بریتییە لە کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی هونەرمەندان لە ڤێنیسیا.
ئەو بینالێیە هەوەڵ جار تەنیا هونەرمەندانی ئەوروپای تیا کۆدەبوونەوە، پاشان فراوانتر بوو تا وای لێهات هونەرمەندی وڵاتانی تریشی تیا بەشداربوون. بۆیەش پێی دەڵێن (بینالێ)، چونکە هەر بە دوو ساڵ جارێک ساز دەدرێ. "وەرگێڕ".

بەڵێ قەوارەیەک هەیە لەگەڵ دیواردا هەڵناکا و
خاکی شەختەبەند وا لێدەکا
لە ژێریدا لار بێتەوە... و
جەمسەری ژوورووی بەرەو خوارببا و
درزێک پێک بێنێ....
کە تا دوو کەسیش بتوانن
بەناویدا تێبپەڕن..

بەهەرحاڵ، گیروگرفتی بۆشایی و روو، گرفتێکی نوێ نییە لە ژیانی مرۆڤدا.

سەدەی بیستەمیش بە بارودۆخی ئاڵۆز و شێواویەوە رێگای دەرکەوتنی خۆشترکرد و وای لێکرد ئەم شێوە دژە لە نیگارکێشاندا وەربگرێ. چونکە گیروگرفتی- روو- و بۆشایی و هونەرمەند بە گوێرەی هونەری بیناسازییەوە وێنەیەکن لە شێوەکانی مرۆڤ لەگەڵ دیواردا. چەند شێوەیەکی ئەزەلین. با شیعرەکەی (جان تیلەر) بە بیر خۆمان بێنینەوە کە دەڵێ:

دیوار زۆر شتە..
پاراستن و حەسانەویە..
دیوار، دەشێ بێ دەنگ بێ
یان بەربەستێک بێ
یا پەنجەرەیەک...
کە سەرەڕۆیەکی نوێی تیا ببینین..
دیوار هێزە..
دەگونجێ لەسەر زەویدا کێل بێتەوە..
دەشێ شوێنەوارێ بێ،

دێرین و خەمبار
بەڵام شوێنەوارێکی پڕ لە شانازی،
کە جێی پێی دانیشتووان و
مۆری رۆژگاری پێوە بێ...
وەک نیشانەیەکی بار و زروفی مرۆڤ.

●



وێنە(148)

بەکارهێنانی بەرەواژی ڕوانگە لە فلیمێکی بزاڤ ئامێزدا



**وێنە(151)**
**هونەرمەند پیکاسۆ**

# گیروگرفتی بۆشایی و روو
# له قوتابخانه هونەرییە نوێیەکاندا

کە لە رێدا لەبەر سینەمای ریڤۆلی[*] "دا وەستای، رێبوارەکان بەخۆ و بەهاش و هوشیانەوە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان دای، داخۆ دەتوانی بە چاوەکانت وێنەی ئەو هێڵانە بکێشی کە پەیوەندی ماڵەکان بە زەوییەوە دیاری دەکەن؟
چەندی تەقەللا بدەی سەرکەوتوو نابی، چونکە ئەو ئۆتۆمبێلانەی لە هاتوچۆ دان و ئەوانەشی کەراوەستاون و بەسەر یەکدی کەڵەکە بوون و رێگا نادەن، دیسان شەپۆلی خەڵکیش چاوەچاویانە رێت لێ بگرن.
بەڵام ئەگەر چاوت بۆ ئاسمان هەڵبڕی، ئەوا بە ئاسانی رووبەری شینی سەر رۆخی ماڵان دەبینی، تۆ لە شینایی ئاسمان بەدەر کە

---

* نووسەر باسی یەکێک لە سینەماکانی شاری قاهیرە دەکا. – وەرگێڕ"

بەبانی روویماڵە لە پاڵ یەکدییەکان دەورە دراوە هیچ نابینی، وەک بڵێی لەو گۆڕەپانەدا بە تاقی تەنێی، هەست دەکەی حەزت لێیە دەست و قاچت بەسەربەستی بجوولێنەوە، حەزت لێیە بڕۆی و هاوار بکەی و باسکان لێ درێژبکەی و وەکو ئەوە دەچیتە بەر هەتاویش بچیتە بەر سێبەر... سێبەر و تاوی سەر رووی ماڵان. بزاقی بێ پسانەوەی ئۆتۆمبێل و دەنگە دەنگ و ئاپۆرەی خەڵکی هەموو تێکەڵاوی یەکتری دەبن و بە قەوارەیەک دەورەت دەدەن و تۆش لێیان ناسڵەمێیتەوە. قەوارەیەک کە پێکهاتووی چەند رووبەکی یەکدیگرەو ئاسمان بەرز دەکەنەوە، ئەویش بە شینایی خۆی سێبەرت لێدەکا.

روانینەکان بەم چەشنە جیاواز دەبن ئەگەر چاو بۆ ئاسمان هەڵبڕی، لەوەی چاو بە دەوروپشتی خۆتدا بگێڕی، لەباری دووەمدا بیر لە هەموو شتێکی دەوروپشتی خۆت دەکەیەوە، لەوە دەترسی لەگەڵ خەڵکی بەیەکدا بچی یا خود بەر ئۆتۆمبێلێک بکەوی، تۆ لە پەڵە رووناکییەک یا پەڵە سێبەرێک یا هێڵێک کە رووکاری جوولانەوە دەنوێنی، یاخود بارستەیەکی کپ کە لەسەر ستوونێکی رووناکیدا دەوەستێ زێتر نیت. تۆ لە نێوان بەیەکداچوونی روو و ژاوەژاوی ژیاندا ون دەبیت، بەو ونبوونەشت خۆت لەگەڵ هەرچی دەوروبەرتەوەیە دەبینی دووچاری ململانێ بووی بۆ ئەوەی بوونی خۆت بسەپێنی، هەر لە خودی خۆتەوە هەست بە یەکبوون و یەکدیگری ئەتەمەکە دەکەی و لە نێو ئەو ململانێیەی زاڵە بەسەر بۆشاییدا هەست ناکەی قەوارەیەکی بە تەنیای چەندی لەباری یەکەمەوەیە، ژیان و ماڵەکانیش لە

چەند کۆڵەگەیەک زیاتر نین کە رووبەرێکی شین رادەگرن، ئەو شینایییەش لەناوەخۆیت دەگرێ، تۆش بەناویدا دێی و دەچی، لە باوەشت دەگرێ و لە باوەشی دەگری.

لێرەشدا مەبەست لە بۆشایی، ئەو رووبەرە بۆشە نییە دامەنی کاغەزەکە یا ئەو قوماشەی نیگاری لەسەر دەکێشرێ دەستنیشانی دەکا، دیسان مەبەستیش بۆشایی نییە لە خودی خۆیدا کە بەهۆی مەودای سێیەمەوە دەردەبڕێ و کە نییە!
بەڵام لێرەدا حەز دەکەین لە توانای دانانی سنوورێک بۆ "بێ پایانی بۆشایی"دابنێین، چونکە هەموو شتێک پێویستە سنوورێکی کێشراو و چەسپاوی بۆ دابنرێ، ئینجا بە پێکەوەبەستنی کێشەی بۆشاییەکی دیاریکراو و ئەو هێڵ و روانەی قەبارەی نێو چوارچێوەیەکی دیاریکراو دەنوێنن، دەگەینە ئەوەی لەو پەیوەندییە هاوسەنگانە بگەین کە کاری هونەری پێک دێنن. پێشان رێگای رەمەکی بۆ دەست خستنی مەودای سێیەم- مەبەست لە قووڵایی نێو وێنەیە- یان بەهۆی چەند هێڵێکی وێک هاتووەوە کە لە پنتێکی لێچوونەوەی سەر هێڵی ئاسۆ پێک دەگەیشتن، لەم لێچوونەوەیەشدا دژواریی ململانێی نێوان سێبەر و رووناکی و دەنگ و پلەکانیەوە کەم دەبووەوە.

روانینی رەمەکی و ئەکادیمی ئەمەیە، بەڵام ئەگەر هاوچەرخانە بڕوانینە ئیستاتیکا و هونەر، ئەوا بەو لەکاربردن و تێگەیشتنە، کە زۆر جاران وێنەی پێوە بەند دەبێ قایل نابین، ئەمڕۆ بایەخ بەوە دەدرێ چۆن یەکەیەکی یەکگرتووی کاری هونەری دەست

دەخـەین، لەگـەڵ ئەوەی هونەرمـەند شـێـوەکـانی بۆ چەند روو و رووبەرێکی دیاریکراو دابەش دەکــات. دیســان روانـینی نـوێ پەیوەندی ناوەخۆی ئەو رووبەرانەش بەهەند هەڵدەگرێ تا دەگاتە ئەوەی ئاهەنگێکی دەبێ. بە گوێرەی پێکهاتنی شێوەکاریشەوە روانینی هاوچەرخانە، بایەخدانی لە دۆزینەوەی هاوسەنگییەکی گــشــتی سنووردار و تەواو یەکگرتوو و ســفت و زاڵ بەســەر تابلۆکەدا گیر بووە.

ئەم جۆرە یەکگرتنە پەیدا نابێ ئەگەر بێت و، بەشێکی وێنەکە سەنگ و هێزی لە بەشەکانی تر زیاتر بێت و لە بەشەکانی دیش روونتــر بێ. ئەم خـەوشـەیش بە ئاشکرا لە رێڕەوی لاســایی کـردنەوەدا لە هونەری وێنەکـێـشـاندا دەبینرێتـەوە کـە سـەدەی شازدەهەم لەسەری رۆیشتوون. دەبینین بۆ دەربڕینی قووڵایی نێو وێنە پێـویستـە شـێوەی پێشـەوەی هێـز و سـەنگی تیـا بێ و روونیش بێ.
پشت بە روانگەیەکی هێڵ ئامــێــز بەســتنیش بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگی و چەسپـاویی تابلۆ، پشت پێ بەستنێکی چرووکە، چونکە لە راستیدا ئەو هاوسەنگییە نەبینراوە، سەبارەت بەوەی پەیوەندی بەو هەڵخەڵەتاندنەوەیە کە یاساکانی بینایی لە بینینی شتاندا پێیەوە بەندە.
بۆ نموونە ئەگـەر دوو هێـڵـمـان هەبوو رێیـەکـیـان دەنواند و لە ئاسۆوە پێک دەگەیشتن، لەو بارەدا ئەم دوو هێڵە سێگۆشەیەک پێک دێنن، جـا چونکە بنکەی سـێگۆشـەکـە لە خـوارەوەیە و لوتکەکەیشی لەسەرەوە، ئەوە گومـانی تیـا نییـە کـە هەستی

هاوسەنگ بوونمان دەداتێ. خۆ کە وێنەکەمان وەرگێڕا، ئەوا هیچ هاوسەنگییەک نامێنێ، کەواتە هاوسەنگ بوونەکە، هاوسەنگ بوونێکی نەبینراوە و هەڵخەڵەتانی بینایی و توانای فسیۆلۆژی بینین دەستنیشانی دەکا.
نموونەیەک دێنینەوە ئەو روانینە نوێیە بچەسپێنێ، با ئەو نموونەیە سرووشتێکی بێ گیان بێ، بڕوانە وێنە (151)، کە نیگارکێشێکی کۆبیزم کێشاویەتی، وێنەی رووکارێکی سادە و ساکار،روو و رووبەرەکانی بە چەشنێکی دیاریکراو و روون تێدا بەش دەبن.

وێنەکە لە یەکەم روانیندا وا دەردەکەوێ پانە و هیچ شوێنەوارێکی مەودای سێیەم یا قووڵاییەکی نێو تابلۆکەی تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا سەیر دەکەی هاوسەنگی نەخشەکێشانەکەمان بە دڵ دەبێت، ئەو هاوسەنگییەی بەرەنجامی پەیوەندی هێڵ و رووبەر و رەنگەکانە بە یەکتریەوە، چونکە هێڵەکانی نێو تابلۆ بە دوایی لێ ناچنەوە. بە گوێرەی روو و پلەی رەنگەکانیشەوە هیچ نابینایی و هەڵخەڵەتانێک لە ئارادا نییە باوەکو پلەو رەنگەکانیش چەند جارە ببنەوە، بۆ ئەوەیە کە جارێکی تر و لە هێزێکی دیکەوە بگەڕێنەوە سەر هاوار و دژواریانەوە، تەواو وەک ئەوەی لە مۆسیقادا روودەدا.

ئەم سەردەمەی ئێمە بەوە دەناسرێتەوە، خێرا بەرەو سادەیی و روونییەوە دەچێ بۆ ئەوەی بگاتە ئەوەی یەکدیگری و توندییەک بە رووی تابلۆ بدا، جا ئەگەر هەوڵی بەراییی کۆپیزمەکان لەگەڵ

ئەو قۆناخانەی بەدوایاندا هاتن بەراورد کرد.
دەبینین کاری ئێستای کۆپیزمەکان لە دەربڕینی بۆشایی و رووداو، لەو هەولانە پتر کارمان تێدەکەن. نیگارەکانی ئێستایان لە پەیوەندیدا ساکارن و هەروەها لە چەند رووبەرێکی فراوانتر و روونترەوە وێنەکێشراون و دوورن لە روو و فۆرمی بچووک و وردیلە. دیسان رەنگیش وای لێهاتووە، پەیوەندی زیاتری بەرەنگی سادە و ناسراوی وا هەیە کە کارێکی سایکۆلۆژی بەهێزیان هەیە، چونکە ئەو فۆرمانەی بەو رەنگە لەبەرچاوانە کێشراون پێش ئەوەی سەرەدەریان لێ دەربکەین کارمان تێدەکەن.
لەمەشدا نابێ بۆ ئەوە بچین کە قەبارە و رووبەری نێو نیگارە هاوچەرخەکان بە چەشنێکی سادە و دژوار تەمومژاوی پان بوونەتەوە.

جا بۆ ئەوەی خوێنەر لە بۆچوونەکانمان بگا: وای دادەنێین سندوقێکی شەش پالووی دار لە ئاستی چاو دانراوە، لەوبارەدا نیگارکێش لە چوارگۆشەیەکی بە رەنگێک بۆیە کراوەوە بەدەر ناتوانێ دەرببڕێ، پاشان بۆ ئەوەی بۆشایی دەرەوەی سندوقەکەشی پێ دەربڕێ. دێ رەنگێکی دی لە دەورو پشت دادەنێ. کەواتە کارامەیی و شارەزایی هونەرمەند لە هەڵبژاردنی جۆر و پلەی رەنگی سندوقەکە و پەیوەندی ئەو رەنگە بە هەموو رەنگەکانی دەوروبەریەوەیە، هەروەها لە پێکهێنانی ساوی هەردوو رەنگەکە و کاریگەریان لەسەر بینەردا. جا ساوەکە لووس و لێک بێ یا زبر و گرنی گرنی، یەکسان دەبن.

چونکە لە هەردووبارانددا هونەرمەند خۆی بۆ ئەوە ماندوو دەکا بەو هەستە بگات کە گەرەکیەتی، لەبەر ئەوەی بەو هەستە دەگاتە ئەوەی ئەو رووخانە دیاری بکا کە رووی سندوقەکە بەرجەستە دەکەن و ئەو بۆشاییەش دیاری دەکەن کە لە پشت و هەردوو تەنیشتی سندوقەکە دایە.

چەمکی نوێی هونەریش لەوەدا خۆی دەنوێنێ، کە رووی بینراو دێتە سەرباری چەند روویەکی بارستە توند، جا لە تێگەیشتنی رووبەری سپی پێش نیگارکێشاندا، بەوەی رووبەرەکە بۆشاییەکی سنووردارە هونەرمەند بۆی نییە وای لێبکات بەرەو دوایی نەهاتن لێ بچێتەوە، چونکە بۆشایی تابلۆکە دیاریکراوەو و چاوی پێدا دەگەڕێ و بەم سەرو بەوسەر لە جوولانەوەدا دەبێ بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی شێوە و روو و هێڵ و رەنگەکان بە یەکترییەوە و دۆزینەوەی تەوەری راگیربوون کە ئاهەنگ پێک دێنێ، بەمەش تێگەیشتنمان بەوە بەند دەبێ کە هەرچەندی وێنە بۆشایی دەربڕێت و هەوای لەبەردا بێ چار نییە دەبێ توندی و یەکگرتوویی ئەو روانەی هەبێ کە دوو روویان هەیە.

خۆ ئەگەر لێچوونەوە و دیماهی نەهاتنیش لە قووڵایی تابلۆدا دیترایەوە، وای هەست لەگەڵدا دەکەین کە هەر لە خۆیدا مەبەستێکە، نەک هۆی دەربڕینی مەودای سێیەم بە چەمکێکی سادە.
ئەم چەشنە خەریک بوونەش بەشێوەو روو، لەو مامەڵانەی هونەرمەند بەهێزترە کە رۆژگارانی پێشوو دەقی پێوەگرتبوو.

کە هونەرمەندیش بەم جۆرە وێنە بکێشێ، پێویستە بەتەواوی لە گیانی ئەو سەردەمە بگا کەتێیدا دەژی و لەبارەی پێکهاتەی فسیۆلۆژییەوەش بەهەموو بنەماکانی هونەری نوێوە بزانێ.
ئێمە دووپات و سێ پاتیشی دەکەینەوە، ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لە ئەنجامی هەستێکی پێگەییوەوە دێ و مەحاڵە تەنیا بەهۆی حیسابێکی رێژەییەوە بە ئەنجامێکی دڵخۆشکەر و هۆشیارییەکی بێ خەوش بگەین.

دەبێ هونەرمەند لەگەڵ بۆشایی و رووە کێشراوەکانیدا بژی و رێزی تەواوی رووبەرەکانی، بێ جیاوازی وەکو یەک بگرێ. جا با ئەو رووبەرە لە پێشەوە یا لە دواوەی وێنەدا بێ. هیچ جیاوازییەکیش لە نێوان بۆشایی پاشڤەبڕ-سلبی- و ئەو نیگارە پێشڤەبڕ- ایجابی-یەی لەسەر دەکێشرێ دا نییە.
کاری هونەری لەسەر کێشەی نێوان، پێشڤەبڕ و پاشڤەبڕ، کاڵ و تۆخ و نێوان ئەو رەنگانەی یەکبوون و ئاهەنگی کارە هونەرییەکە پێک دێنن، بنیات دەنرێ.

بۆشایی پاشڤەبڕ و ئەو شێوە پێشڤەبڕانەی رووبەڕووی بوونیان دەوەستن، جیاواز نین، چونکە گشتیان وەکو یەک سوورن لەسەر ئەوەی کە هەوڵی دۆزینەوەی پێشڤەبڕێکی خڕگرەوەی کاری هونەری دەدەن. هیچ جیاوازیەکیش لە نێوان رووبەرێکی بە بزاڤ و زیندوو یەکێکی دیکەی هێمن و وەستاودا نییە. هەر خۆ تەنگاوکردن و هەڵچوونێکیش بۆ دۆزینەوەی ئاهەنگێکی ئاوازدار لە وێنەدا، دەبێ بەهۆی وێکهاتنەوە و ساردو سڕی

تەواوی کارەکە، بۆیە دەبێ زیندوویی روو خۆکار بێت، تاکو کە سەیری کارێکی هونەریمان کرد سەربەست چاوی پێدا بگێڕین و لە پنتێکی راگیربوونەوە بۆ پنتێکی تر، چاومان بەنێو رووبەرەکەدا دەگەڕێ و وێنەکە ئابلووقە دەدا و یاسا ئاهەنگیە ئاڵۆزەکانی دیاری دەکا. زۆرجاریش کارێکی هونەری رەسەن و تەواو، لە ئەنجامی دەمارگیری و تەکاندان و ئازادی دەستی هونەرمەندەوە دێ بەپێی هەڵچوون و تاوگیریی هونەرمەند لەسەر رووداو. ئینجا ئەگەر لە کارێکی هونەریی نوێدا رابمێنین، ئەو رووبەرە بەتاڵە بە ئاسانی دیاری دەکەین کە بۆشایی دەردەبڕێ. دیسان لە گرینگیشدا لەو رووبەرە کەمتر نییە کە نیگارێکی کێشراو دیاری دەکا. ئەوە لێک دەکەینەوە کە ئاهەنگی گشتی وێنە بە تەنیا لە گەرمۆکەیی رووبەری پێشڤەبڕو زیندوویی ئەو رووبەرە وەبەر نایێ، بەڵکو لە ئەنجامی کێشەو ململانێی گشت رەگەزەکانەوەیە، یەک بەوەکەی دی، جا چ پاشڤەبڕ یا پێشڤەبڕبێ. تێگەیشتنی تازەی شێوەو پەیوەندیی بە بۆشایی تابلۆوە لە چەمکی ئەبستراکت (تجرید)ەوە abstract نزیکمان دەکاتەوە، وشەی(ئەبستراکت)یش لە رێبازە هونەریە نوێیەکاندا پتر لە مانایەک بەخۆیەوە هەڵدەگرێ. بەڵام ئێمە ئەم واژەیە دەتوانین لە دوو بەکاربردنی لێک دووردا لێک بدەینەوە.

یەکەم:

ئەبستراکتی دیاری نەکراو -Non figurative- مەبەست لەمەشدا ئەو رووتکارانەیە، کە واقیعی سرووشتیی شتان وەک خۆی پیشان نادەنەوە، بەڵکو ئەو پەیوەندییە رێژەدارانە پیشان

دەدەن کە دەستنیشانی شێوەکان دەکەن، بێ ئەوەی دەقی رووەتی دەرەوەی شێوە بپارێزن.
بە واتا ئەم جۆرە کارانە هەموو یاسا بینراوەکان دەنوێنن کە دەبن بەهۆی هاوسەنگبوونی قەبارەکان لە پەیوەندیاندا بە بۆشاییی، نموونە، بۆ ئەمەش کاری هونەرمەندە کۆبیسزمە نوێیەکان و هونەرمەندان (فیۆن و خاتو فیرادی سیلفیا و رەمسیس یۆنان و مەحمود حلمی)ن.

بەڵام بەکارهێنانی دووەم:
ئەبستراکتی نابابەتییە -Non objective- ئەمەش ئەو کارانە دەگرێتەوە کە دەربڕینی رەهای جوولانەوە و سرەوتن، لە واقیعی ژیانەوە وەردەگرێ، بەبێ هیچ پەیوەندییەکی رێژەداری رووبەرو هێڵەکان، ئەو رەگەزانەی لەوان وێنانەدا کێشراون لە چەند هێڵێک و رەنگرێژیی و چەند تیزماڵێکی رەنگیی پان ناچنە دەرەوە، لە شێوەشدا چەند رووبەرێکی سادە و ساکارن، وەکو کاری هونەرمەندان - مۆندریان و پۆل کلێ.
ئەم تەرزە دابەشکردن و پێناسانەش بۆ پۆلینی کارە هونەرییەکان دادەنرێ، تا بتوانین رێڕەوی هونەری نوێ دیاری بکەین و چاوەدێری پەرەسەندنی بین، لە داکەلانی لە ریالیزمەوە بۆ ئێکسپرێژێنیزم [30]. و...تاد... وەکو هەوڵێک بۆ گەیشتن بەهۆیەکی قووڵتری دەربڕین، لە خۆبەستنەوە بە وەسفێکی خەبەری تا سەربەستییەکی خڕگرەوەتر. ئەم سەربەستییەش لە گۆڕانی ئەو پەیوەندییە شێوەکارییە رووتانە پێکهات، بێ ئەوەی خۆی بە هەیکەلی بینراوی شێوە ببەستێتەوە.

بەڵام ئایا هونەرمەندێک دەتوانێ هەروا بەو ئاسانییە لە ریالیزمەوە بەلای ئێکسپرێژێنیزم ئینجا ئەبستراکتەوە دابکەلێ، ئایا دەکرێ بە هەموو هەڵچوون و لاساییکردنەوەیەکی رووت بڵێین هونەر؟
هونەرمەند کە لاسایی بکاتەوە یا هەڵبچێ، راستییەکەی لە خۆی زیاتر کەس هەڵناخەڵەتێنێ، مەسەلەکە زۆر لەوەش ئاڵۆزترە.
پێویستە هونەرمەند بە حەقیقەتی ئەو کارەی بزانێ کە ئەنجامی دەدا وەکو مافی ئەوەشی هەیە لە زمانی راستەقینەی شێوە بگا و هەروەها لە گیانی راستەقینەی چەمکی ئەو سەردەمەی تێیدا دەژی و رادەی پەرەسەندنی تەکنەلۆژی کە بەسەریدا زاڵە، ئەمەش بێ ئەوەی بڕوای بە مرۆڤایەتی و شاعیریەتی سۆزەکان، یاخود شتە خاوە سرووشتییەکانەوە لەق ببێ.

بەمەش یەکەمین هەنگاوی دەخاتە سەر رێی مەبەست بۆ گۆڕانی روانینەکانی، واتە بە تێگەیشتنی کێشەی روو و پەیوەندی بە بۆشاییەکی دیاریکراو، دروستی دەکا. ئیتر لەوەدا نەماوە شێوەکانی هونەرمەند روانینەکانی بۆ روو دیاری بکەن، بەوەی چەند رووبەرێکن بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بابەتانەی لە بۆشاییدا

•




وێنه(152) قەڵەمكێشێكی هونەرمەندی سەنگتراش جیا كۆمێتی.



وێنە(153) لە کارەکانی هونەرمەند کیسلنج

لێ دەچنەوە بەکاریان بێنێ.

# ڕەگەزی دەستخەڵەتدان و لێڵیی لەکاری هونەریدا

هەر کە مرۆڤ کتێبێک یا گۆڤارێک بەدەستەوە دەگرێ، یەکسەر ئەم دیو و ئەو دیوی پێ دەکا، بە دوای وێنەیەک کە دێڕە نووسراوەکانی دەنەخشێنێ، بەوپەڕی تاسە و ئارەزووەوە تەماشای دەکا. چونکە ئێستاش ئەم چەشنە وێنانە خوێنەری عادەتی بەلای خۆیاندا رادەکێشن، لەگەڵ ئەوەی لەو وێنانەن هەواڵ و مانایەکی وەسف ئامێز لێک دەدەنەوە و سەنگ و قووڵییەکی هونەریان نییە.

لە هەمان کاتیشدا زۆر جاران سەیر دەکەی هەر ئەو کەسە عادەتیانە دڵیان لەو کتێبانە دەگوشرێ کە بە تابلۆی هونەرمەندە مەزنەکانەوە نەخشێنراون.

ئێمە ناتوانین ئەو تەرزە وێنانە، وەک چەشنێک لە جۆرەکانی هونەری شێوەکاری، لە خانەی هونەر دابنێین.

جیاوازی نێوان ئەو وێنانە و جۆرەکانی هونەری راستەقینەش دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی، ئەم جۆرە وێنانە ڕەگەزی ڕێکخراویان

نییە کە پەیوەندی ڕەگەز و بەشەکانی کارەکە پێکەوە دەستنیشان دەکا. مەگەر دەسکردی هونەرمەندێکی بەناوبانگ بێ، چونکە وەک وتمان وێنەی کەسێ یا هی شتێ لەو نیگارانەی بۆ ڕوونکردنەوە دەکێشرێن، لەوەی زیاتر وەسفی شتێک یا هەواڵێک ڕادەگەیەنن، هیچ ناگەیەنن، واتە بە شێوەیەکی گشتی، تەباییەکیان لە پەیوەندییە شێوەکارییەکاندا نییە. بۆیە ئامانج و ئیشی نیگارکێشی کە کتێب و گۆڤاران دەنەخشێنێ، ئەوەیە، وا بکا نیگارەکەی ڕوون بێت و چەندی پێی بکرێ لە سرووشت نزیک ببێتەوە. بۆ وێنە، پیاوێکی دانیشتووی سەر کورسییەک لە وێنەی هەواڵێکدا لەوە زیاترمان پێ ناڵێ کە پیاوەکە دانیشتووە و هیچی تر. چەندی لەکاری هونەرییە، بەهای پیاوی دانیشتووی سەرکورسی لە پەیوەندییە شێوەکارییەکاندایە بە گوێرەی تەواوی تابلۆکە.

هونەرمەندان لەگەڵ ئەو ئەزموون و شارەزاییەشیاندا، وێنەکانیان تەواویش دەکەن بێ ئەوەی پلانێکی بۆ دابنێن و بە چەشنێکی دیاریکراو بە شوێنە جوانەکانی بزانن کە دەری دەخەن.

هەندێ جار کە هونەرمەند ڕەنگێکی نوێ یا ڕووبەرێک دەخاتە سەر وێنە، تەماشا دەکەی پێکهاتەی وێنەکە دەگۆڕێ بۆ ئەوەی ئەو ڕەگەزە یا ئەو ڕەنگ و ڕووبەرە نوێیە بتوانێ لەگەڵ ڕەگەزەکانی دی کە کارە هونەرییەکە پێکدێنن یەک بگرن و تێکەڵ ببن جا هەرچەندی ئەو لێ زیادکردن و گۆڕانە کەم بێ هەمیشە دەبێ بەهۆیەک بۆ دووبارەکردنەوەی پێکهاتنی

سیستەمی ئەو یاسایانەی کاری هونەری دروست دەکەن، بۆیە تەواو لەگەڵ باری پێشووی وێنەکەدا جیاواز دەبێ.
چەند شتێکی ورد و کەمیش کارێکی هونەریی مەزن دیاری دەکەن.

کەسایەتی هونەرمەندیش چەندی مەزنتربێ و بناسرێتەوە، هەندە کارەکانی لێڵ و تەمومژاوی دەبن و بەشەکانی ئاشکرا نابن و سیفەتەکانیشی بە ئاسانی دەرناکەون، کە هەر ئەمەشە رەنج بە مێشکی کەسێکی عادەتی دەدا و ماندووی دەکا، بەبێ ئەوەی پێی بزانێ. بۆیە دەبینین بێ ئەوەی هەستی پێ بکا، خوو دەداتە نیگاری سەنعەتکارە شارەزا و شێوێنەرە ساختەچییەکان، چونکە ئەوان کەمترن لەوەی بیخەنە بەردەم دۆش دامانێک، کابرای عادەتی دڵی بە کارێکی شێوێنەر دەکرێتەوە کە شێوازی هونەرمەندێکی بە توانای بۆ دەکێشێتەوە، هەروەها بریقەی رەنگ و ساوی سەر رووی، بێ گرفت و دەمارگرژی و ژان بۆ دەکێشێتەوە.. واتە تەنیا لایەنە شیرینەکەی بۆ دەکێشێ و لایەنە تاڵەکەی وەلا دەنێ.

لەو چەند دێڕەی پێشوودا باسی چۆنیەتی جیاوازی کاری هونەری و ئەو وێنانەی گۆڤار و کتێبان دەڕازێننەوە-مان کرد. زۆر جاریش نیگارکێشە گرگن و بەکرێگیراوە شارەزاکان دەیکێشن، یا هەندێ هونەرمەند بۆ کاسبی... کە لە کاری راستەقینەی هونەریانەوە بەدوورە. ئەم وێنانەش پێیان دەڵێن illustration.

ئێستا دەبینین کە کاری هونەری چۆن لەگەڵ ئەو جۆرە نیگارانەی بەمەبەستی روونکردنەوە دەکێشرێن جیایە، کە پێشی دەڵێن Diagram.
دایەگرامیش ئەو نیگارانەن بۆ روونکردنەوەی ئیشێک دەکێشرێن و لەگەڵ کاری هونەریشدا دێنەوە و پێچەوانەی ئەو نیگارانەشن کە چاپکراوان، دەڕازێننەوە. ئیشی ئەوەیە، پنتەکانی راگیربوون لەکاری هونەری و رووکارەکانی جوولانەوە و پلەی سێبەر و رووناهی و جیاوازیان و..تاد لێک دەداتەوە.

هەرلەمەشدا دەبینین کاری هونەری چۆن دەبێ بە نیگارێک و ئەو بنەمایانە دەچەسپێنێ کە لە رەگەزە جیاجیایەکانی شێوەدا ئەم کارەی لەسەر بنیات نراوە، تا هەر رەگەزێک لە رەگەزەکانی فۆرمەکەدا بە روونی و چەسپاوی دەردەکەوێ.

ئەم چەشنە نیگارانە پێیان دەگوترێ Diagram تەنیا ئەو بنەمایانە دەردەخا کە لەو دیوی ئەتەمی تابلۆوە شاردراونەتەوە و چوونەتە باڵییەوە، یاخود بە فۆرم و قەبارە و کەسەکانەوە داپۆشراوە.
ئایا دەکرێ بەو وێنانە بڵێین کاری هونەری؟ ئەم جۆرە وێنانە هەموو بنەماکانی کاری هونەری بەخۆیان دێڵنەوە و بگرە لێشی تێدەپەڕن، ئەمەش دیارترین ئادگاری جوانی و تەواوین تێیدا. ئەو کارەی لەوانەیە رەگەزەکانی تێ نەگەین، یا لە یەکەمین ساتدا روون نەبێتەوە.

ئا ئەمەیە کاری ئەو نیگارانەی پێی دەڵێن Diagram، لەگەڵ ئەوەشدا بەهیچ شێوەیەک ناتوانین بەو نیگارانە بڵێین کاری هونەری، یاوەکو بە روونکاریش لە کاری هونەری جیا دەکرێنەوە، بەڵام رەگەزی روونکاری کۆڵەگەیەکی ئەوەندە قایم نییە لە دروستکردنی کارێکدا، چونکە لێکدانەوە و رێنمایی کردن ئیشی کاری هونەری نییە.

دیسان روونکردنەوەی شتێک جیایە لەگەڵ ئەوەی مەبەستمان لە زەین روونی بێت، چونکە زۆر جاران لەگەڵ روون بینینیشدا لە نهێنی کاری هونەری ناگەین، هونەرمەندیش وێنەکەی لەسەر ئەو رەگەزانە بنیات دەنێ کە گرنگییان لەوەدایە دەستخەڵەتت دەدەن و لێڵ و نادیارن. ئەوەی راستیش بێ ئەوەیە ململانێی دوور و بەردرێژی هونەرمەند لەگەڵ تابلۆدا، دەیگەیەنێتە ئەوەی کارەکەی بە وێنەی خودی ژیان، لەیەک کاتدا ساکار و لێڵ بێت.
هونەرمەند چۆن ئەمە دەکا و بۆچی دەیکا و چی دەکا تا ئەوەی دەست بکەوێ؟
با هەوڵ بدەین نەختێک بیربکەینەوە، با لە کارێک رابمێنین، گریمان کارێکی هونەری (جاکسۆن پۆڵۆکمان) لە پێشە، سەیر دەکەین کێڵگەیەکی ئاڵۆزی لەو داوداوانەی شێوەی نادیار دەهۆننەوە بۆ دروست کردووین و چین چین، بە چڕی کەوتوونەتە سەر یەک، وەک ئەوەی ئەو پنتانە دەیانەوێ لە سەرەنجامێکی لێڵ و نادیاری ئەوتۆمان باوێن، کە نە دەتوانین لێکی بدەینەوە و نە دەشتوانین لێی ببینەوە!.

چەند هێڵـێکن دەست خـەڵەتت دەدەن و لێت دەسـەنگرێنەوە و ناتوانی بە چاوەکانت بەدوویاندا بچی.

جا ئەگەر ئەوەی لە پێشمانە کە دەم و چاوێکی (رامبرانت)[31]ی هونەرمەندە، دەبینین ئەوەی کە شێوەکە دیاری دەکەن ئاگاداریی تەواوی هونەرمەندە لە نواندنی هێڵی دەرەوەدا. کەچی لەگەڵ ئەو ئاگـاداریەشـدا هێـڵی دەرەوە (-ئاوت لاین- out line) بە تەواوی روون و دیار نییە، چونکە چەند بەشێکی لەگەڵ بۆشایی دەوروپشـتی وێنەکـەدا چوونەتە باڵ یەک، ئەو بەشـە لە باڵ یەکـانەش ون ناکـەین و وەکـو کـەموکـوڕییـەکی بنیـات نانی هونەریش هەستی پێ ناکەین، بە پێچەوانەوە کە پێمان زانی وا هەست دەکەین پێویستییەکی بنیاتنەری کارەکەیە.

گەلێ جار بەشێک لەو هێڵە ون دەکەین کە دەم و چاو دیاری دەکـا، بۆیە دەبینین لایەکی دەم وچاو لەتاریکیدا نقـوم دەبێ، بەبێ ئەوەی دیماهییـەکی دەستنیشـان بکەین، یاخـود لە نێـو رووناکیدا ون دەبێ، هەمدیس بێ ئەوەی دیماهی دەم و چاوەکە لە سەرەتای بۆشاییدا دیاری بکرێ. جاری واهەیە شانی پیاوەکە یا شەپقەکەی یا پۆپیتەکەی، بە ونبوونی بەشێکی ئەوانە کابرای وێنەکێشـراو بە بۆشـایی دەوروپشـتی دەبەستێتەوە. بینەری تامەزرۆش سەعاتەها لە پێش وێنەدا دەوەستێ بێ ئەوەی بەهیچ جۆرێک ئەو بەشە نادیار و ون بووانە بناسێ و دەرکیان پێ بکا.

خۆ ئەگەر لە نیگارکێشان و یەکالاکردنەوەش بزانێ ئەوا یەکسەر فێڵەکە دەدۆزێتەوە، دەگاتە ئەوەی مەحاڵە لای دەم و چاو یاخود

کەللە تەواو بکرێ، چونکە دەبێ بەهۆی ئەوەی کەموکوڕییەک لە پێکهاتنی سەرەکە دەردەخا و دەیشێوێنێ. بەڵام (رامبرانت) بە فلّچە وەشاندنێکی زیرەکانە ئەو بەشەی لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی خستۆتە باڵ یەک و شێوەکەی بۆ بە بۆشایی بەستووینەتەوە و بەسەر گشت ناتەواوییەکدا زاڵ بووە. جیهانێکی لە سێبەر و ڕووناهی پێ داوین، جیهانێک کە سەرسامان دەکا و وامان لێدەکا چەندین سەعات لەبەردەمیدا بمێنینەوە.

لەهەر کارێکی مەزن رابمێنی، چەشنە فێڵێکی مەزن دەدۆزیەوە، بڕوام پێ ناکەی و دەڵێی ئەم قسەیەم زیادەڕۆییە. ئەمەش ناکرێ ببێ بە راستییەکی چەسپاو یا دەستوورێک دەقەبەری هەموو هونەر و هونەرمەندێکی بکەین.

دەشێ کارەکانی ئەم دواییەی هونەرمەندی هۆڵەندی (مۆندریان)م بۆ بێنیەوە، ئەو کارانەی لەچەند رووبەرێکی لاکێشەیی بەدەر نین کە هونەرمەند بەهۆی چەند هێڵێک، بەپانی و بەدرێژی دابەشی کردوونەتە سەر چەند چوارگۆشە و لاکێشەیەک، پێم دەڵێی ئەم وێنەی وەکو نیگارێکی ئەندازەییە. ئەمەش هەرگیز وانییە، چونکە تەنانەت ئەستوورایی تاقە هێڵێکیش لەم وێنانەدا، بەشەکانی یەکسان نین، هیچیشیان بەوەکەی تر ناچێ، لای هەر چوارگۆشەیەک یا لاکێشەیەک لەم وێنەدا بپیوی، لە فێڵێکی نەبینراو هەڵدەنگوی، چونکە هیچ لایەک لەگەڵ لایەکانی تر نایێتەوە.

ئایا (جۆزێف ئالبرێس)ی هونەرمەند کە کارەکانی لە چوار گۆشەی نێو چوارگۆشەیەکی دی یا لاکێشەیەک بەدەر نییە، داخۆ بۆمان هەیە، یا دەکرێ بڵێین ئەم وێنانە نیگاری ئەندازەیین یاخود بۆ روونکردنەوە دروست کراون؟
سەیری رۆخی چوارگۆشە سادەکانی و گۆشەکانی بکە، هیچیان نابینی (90 پلە) بێت- ئیدی بەرهەست بوون و نهێنی و فێڵی بەهۆی ئەم جۆرە لادانە سادانەوەیە، کە بە ئاستەمیش لە (لا)ی چوارگۆشەکانیدا نابینرێ.

لەکارەکانی (رۆنکۆ)شدا زەین دەدەینێ هێڵێکی پچڕ پچڕ و خوراو، روو و شێوەکانی دیاری دەکا، ئەم سنوورە پچڕپچڕ و خورانەش خۆ حەشار دەدەن و بە دزییەوە دەست خەڵەتت دەدەن، تا ئەوەی چاوت لە گرتن و پێگەیشتنیاندا ماندوو دەبن، توانای ئەوەت نابێ رووبەرەکانی لە یەکتری جیابکەیەوە. چونکە - روو-ەکان بۆ ئەوە لە بەرچاوی بینەردا دەردەکەون کە لێی رابوەستن، پاشان زۆری پێ ناچێ ون دەبن و لێ دەچنەوە و وات لێدەکەن نەتوانی دیاریان بکەی و بیانگری.

بەم جۆرە دەبینین کە بەرهەستیی و نهێنی هونەرمەند و هێزی دەرەوەی، بە زۆری لەسەر توانای خۆیەوە دەوەستێ کە تارادەیەک لێڵ بێ و دەست خەڵەتت بدا و هەڵتبخەڵەتێنێ.
ئەوەی لێرەشدا پێی دەڵێن نهێنی هونەرمەند و بەرهەستیی.. راستییەکەی لە ئەنجامی ژان و کۆششی دڵسۆزانەیەتی لە بەرابەر نادیاریی واقیعی ژیاندا.

هەر بەو جــۆرە دەبینین بەهای ژیان هێــشــتــا نادیار و سەرسوڕهێنەرەو، سنووردار و روونیش نییە.

ئەم دەستخەڵەتدانەش لە رەنگدانەوەی حەپەسانی هونەرمەند و ناتەوانایی و دوودڵیی نێو ناخییەوە پتر نییە. ئەو دوودڵییەی

•



**وێنە(154)**
**بەیەک گەیشتنی چەند دەستێک – فۆتۆگراف**



**وێنە(155)**

**بەیەک گەیشتنی چەند دەستێک لەشەڕدا، دەسکردی هونەرمەندی چیکی(شۆبێک)**



**وێنە(156)**

**هونەرمەند – فرنان لیێچێ**



**وێنە(157)**
**چەند چەترێک**

لە خۆیدا بنەمایەکی سووتانیەتی.

## پەیوەندیی هونەرمەند

سپێدەیە، تۆ لەسەر ڕێدا چاوەڕوانی، لەسەر شۆستەدا وەستاوی، دەستت لە شوورەی ئاسنینی سارد گرتووە، ئۆتۆمبێلەکان بەرەو ئەو سەری شەقامی (سلێمان پاشا)(*)
وەک ئەوەی ئەژدیهایەکی شێتی تێدا بێ، تەکان دەخۆن و ماندوو نابن. چاویان تێدەبڕی بە درێژایی شەقامەکە، کە بە رووناهی بێ تێنی سپێدە شۆردراوەتەوە، کۆتەڵی- تەلعەت حەرب- قیت بووەتەوە، دەڵێی ها ئێستا بنکەکەی بە تیشکی بەتاوو زێڕین دەتوێتەوە. پشتیشی ساختمانی -التحریر-ە بەسەر کۆتەڵەکەدا لار بووەتەوەو هەناسەی لەبەر بڕیوە.
تۆ ئەوە دەزانی کە شەقامی (سلێمان پاشا) لە راست کۆتەڵی تەلعەت حەربدا دوایی نایە و دەڕوا لێی رەت دەبێ، ساختمانی -التحریر- یش بەهۆی مەیدانی -التحریر-ەوە لەوسەری شەقام دابڕاوە.کەواتە چی وای لێکردی ساختمانەکە بە پەنجەرە

* شەقامێکە لە شەقامەکانی شاری- قاهیرە-ی پایتەختی میسر - وەرگێڕ

ریزکراوەکانییەوە ببینی نزیک بووەتەوە و بەسەر کۆتەڵەکەدا لاربووەتەوە و بێنی تەنگ کردووە؟ ئایا یاساکانی بینین و مەودای سێیەم ئەمەی لا دروست کردووی؟ چونکە هەر ماوەیەک بەپێی کەمبوونەوەی قەبارەکان وێک دێنەوەو لێک دەکێشرێنەوە تا لە ئاسۆدا لێ دەچنەوە.

ئەویان لە مێشکت دوور دەخەیەوە، چونکە رەنگدانەوەی رووناکی و پەیژەیی شتەکان لە لێلاییدا چەندی دوور بێتەوە لەگەڵ دەرنەکەوتنی - شتە وردەکان- بەسە بۆ ئەوەی وات لێ بکەن درێژی ماوەکان و شوێنی ئەو شتانەی تیایەتی بە تەواوی ببینی. کەواتە چی وای لێ کردی دیمەنەکەی پشتت بەو چەشنە ببینی؟ بێگومان شتێک هەبووە وای لێکردبی شەقامەکە بەم وێنەیە بەرجەستە بکەی.
ئایا لە تەنگ و چەڵەمەیەکی دەروونیدا دەژی؟ هەوڵ دەدەی بە بیر خۆتی بهێنییەوە داخۆ پێشتر ئەمەت لە کوێ دیوە. کۆتەڵێکی رۆشنکراوە.. عاردی راکشاو و ساختمانێکی زەبەللاحیش بە پەنجەرەی ریزکراوەوە بەسەر کۆتەڵەکەدا لار بووەتەوە.

بیرکردنەوە ماندووت دەکا، تا لە دواییدا بەبیرت دێتەوە کە هەوەڵین وێنەکانی (دی کیرکۆ)[32]یە ئەوانەی روانینی میتافیزیکی دەنوێن، ئەو وێنانەی کۆتەڵی رۆشنکراوی تیا دەبینین، ساختمانی زلی وێنەی زیندانانی بەسەردا لار دەبێتەوە.هەر بەمجۆرە، هەمیشە کە هونەرمەند سەیری شتێکی

پێش خۆی دەکا، خۆی وا دێتە بەرچاو کە لە هەمان کاتیشدا پابەندی شتێکی تریشە. یاخود کارێکی هونەری کە بەهۆی یادکردنەوە هەستی پێدەکا، ئەوەی کە هەستیشی پێ دەکا بەهۆی باری دەروونییەوەیەتی. لە ئەنجامدا داهێنانی هونەری لەسەر تێکەڵاوکردنی ئەو شتەی دەیبینێ و ئەوەی کە پەیوەندی پێوە هەیە دەوەستێ، چونکە هونەرمەند مامەڵە لەگەڵ شتێک دەکا، کە لە مێشکیدا پابەندی شتێکی دیکەیە، ئیتر تێکەڵیان دەکا ئەو دەمە هەڵسەنگاندنی ئێمەش بۆ ئەو کارە هونەرییە لەسەر رادە و جۆری، بەرهەستییەتی هونەرمەند لە تێکەڵاوکردنیان دەوەستێ کە چی لێرە و لەوێ وەرگرتووە. بەڵام هیچ زەرەرێکی تێدا نییە ئەگەر بگەڕێینەوە و لە پەیوەندیی هونەرمەند بە واقیع و بەشتانەوە بدوێین.

گۆڤارە بیانییەکان ئەوەمان پێ رادەگەیێنن، هونەرمەندێکی ئەبستراکتی- بەناوبانگ پاشگەز دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر کێشانی وێنەی بابەتیی دیاریکراوو بە واقیعی بینراوە وە بەستراو. ئەمە بێجگە لەوانەی هەر لەبنەڕەتدا مەسەلەی پەیوەندیان بە رێبازی - ئەبستراکتیش-ەوە لە خۆیان دوورخستۆتەوە. ئەمانە مەسەلەی دوورکەوتنەوەی هونەرمەندیان لە جیهانی بینراودا رەت کردۆتەوە. ئەمە لەبەرچی وا دەبێ؟
یەکێکمان وەڵام دەداتەوە: چونکە هەندێ هونەرمەند گرنگی لەوەدا دەبینن کە شتان چۆن دەبینن وای بەرجەستە بکەن، لەگەڵ ئەوەی وەکو خۆشی نایکێشنەوە هەست دەکەن پێویستیان بە دابونەریت و واقیعەوە هەیە.. یا دەڵێت: ئەوانی دی خۆیان

ئاوەها دۆزیوەتەوە، لە رێی ئەوەی هونەرمەندێکی پێش خۆیان چووەتە دڵەوە بە قەوارەیەکی هونەری گەیشتوون.
ئێمە چەند هونەرمەندمان دیوە وێنەی گوڵەبەرۆژەی کێشاوە، دوای ئەوەی وێنەی ئەو گوڵەبەرۆژانەی بەدەستکردی (ڤان کۆخ)[33] چووەتە دڵەوە.

با ئەم جۆرە وەڵامانە تارادەیەکیش راست بن، بەڵام راستیش نییە کە بەو ئاسانییە لەم مەسەلەیە بدوێین. چونکە گرنگی بابەت لە هونەردا، لە بۆچوونی ئێمە فراوانترە، ئێمە لە ژیانماندا پابەندین و بە زۆر شت کار لێکراوین، وەکو خۆر و شەو و درەخت و گوڵ و بەروبووم و خاک و رووبار.. هەمووئەمانە کارمان لێدەکەن و بۆ ئەوە دەست دەدەن ببن بەبابەتی هونەرمەند، بینەریش بەدەوری خۆی لەگەڵ ئەم شتانەدا دەژی، بۆیە ئەمە ماددەیەکە هونەرمەند دەتوانێ هەست و بیری خۆی پێ رابگەیەنێ، لەبەر ئەوەی ئاسانیش نییە خەڵکی هەموویان لەسەر تاقە شیکردنەوەیەک بۆ شتە وێنە کێشراوەکە بگەنەوە یەک، یا بەو مەبەستە بگەن کە هونەرمەند گەرەکی بووە. بۆیە ئەوەی چێژی لێ وەردەگرێ، هەمیشە بەو لایەدا دێتەوە کە بابەتە بینراوەکە لە بەینی هەردوولادا قبووڵ بکا، چونکە دەتوانێ خۆی پێ قایل بکا بەوەی لە هونەرمەندەکە گەیشتووە، ئای کە ئەو نیوەڕاست وەرگرتنەش چەندی شەرمەزار دەکا.

دەگونجێ شتەکە هێمایەک بێ، لەوانەیە وەکو چەمکێک بێ بۆ کارەکەی و هەروەها بۆ پەیوەندیشی بە ئێمەوە.

لەوانەشە وانەبێ و بە تەرزی جیاواز لە خەیاڵماندا بژی کە تاقیکردنەوەکانی ناوەوەمان و هەلومەرجی جیاواز و بەهۆی بێ هاوتایی و بەرکەماڵیی بەگوێرەی ئێمەوە دیاری بکرێ.
شتەکە بە جۆرێک لە بیرماندا دەژی کە خۆزگەی بۆ دەخوازین، ئەمەش وێنەیەکە بەهۆی خۆشویستن و رق لێبوونەوەمان دەستنیشان دەکرێ.

ئێمەلەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن سێوێک دەبینین تەواو سووربێ، کەچی رەسین و شیرینی سێو بە رەنگی سوور بەستراوەتەوە، بەم جۆرە چەمکی رەنگی سێو بە گوێرەی خەڵک هەمیشە سوورە.
بەڵام ئێمە (ماتیس)"34" یشمان دی کە بەهۆی پلەکانی رەنگی شینەوە وێنەی سێوێک دەکێشێ، ماتیس وێنەی سێوی بە رەنگی شین کێشا، لەگەڵ ئەوەی بینەر سوورە لەسەر ئەوەی کە سێو سوورە. بەمەش (ماتیس) بەبێ هاوتاییەکی دیکەی بەستەوە ئەویش ئەوەیە کە لە توانادایە پەیوەندییەک هەبێت بێجگە لەو پەیوەندییە..ئەو فێڵەی (ماتیس) لێرەدا هێنای لەسەر ئەوە وەستاوە، توانی بەو پەڕی باوەڕ بەخۆبوون و هێز و گرنگییەوە وێنەی بکێشێ و زۆری نەمێنێ بمانگەیەنێتە ئەوەی بڕوا بەوە بێنین (سێوی شین) یش هەیە، یا هەرچی نەبێ بڵێین تو خوا باشتر نەبوو، یا چی تێدایە ئەگەر سێو شین بێ؟
کەواتە (ماتیس) بینەری بەوە قایل کرد سێو شینە، یا وای لێکرد لەبیری بچێتەوە کەرەنگەکەی رەنگێکی ئاسایی نییە.

ئەم گۆڕانەش کەوا دەردەکەوێ سادە و ساکارە، بەڵام هونەرێکی

مـــەزنی دروست کـــــردووە، هەر ئەوەشـــــە هەمـــــوو بنەمـــا شێوەکارییەکانی لەسەر بنیات نراوە و وای لێکردووین سێو بە ڕەنگی شینیش قبووڵ بکەین.

یاسـای شێـوەکـاریی دیکەش هەن کـە لەوێنەکـەدا هێناویەتی و بوونـی سـێـوی شین دەچەسـپـێنن. مـاتیس ئەمـەی بۆیە پێکرا، چونکە دەسـتی بەسـەر پیـشـەی نیگارکـێـشـان و ڕەنگکردندا دەشکێ، تا ئەوەی زۆری نەمـا چەمکی بینەر لە بارەی سێـوەوە بگۆڕێ و بە ڕەنگی شینی پەیوەند بکا کە خۆشیی ژیانی تێدایە. بەڵام داخـــۆ چی وای لێکرد وێنەی سـێـــوەکـــە بەرەنگی شین بکێشێ، داخۆ ئەو ڕوانینە ئاخنراوەی نێو هۆشی ناوەوەی چی بێ بتـوانێ ئەو سەرکـەوتنە بەدەست بێنێ؟ڕەنگە شینەکەی لە کوێ هێنا؟ کێ دەزانێ؟ لەوانـەیە کـــە منداڵ بووە دایکی یا پووری کراسێکی گوڵ گوڵیی شینیان هەبووبێ، ئیتر لەناکاو پەرش و بڵاویی سێوی سەر مێزەکە کراسەکەی بیر خستبێتەوە، ئەویش لە ڕێگای ڕەنگی شینەوە.

دەتوانێ کارە هونەرییەکەی بنیات بنێ، ئەو ڕەگەزانەش کە فۆرم پێک دێنن، هەر یەکـێکی بایەخی خـۆی هەیە، بەڵام نیگارکـێش بە تێکەڵاوکـردنیـان و بەوەش کـە بە هەسـتی ناسکی دەیخـاتە سـەر، هێـزێکی کـاریگەری دەبێ تاکـو گـیـان بەبەر ئەو کـارە هونـەرییـەدا دێنێ، نموونـەی ئەمـەش وێنەی ڕووبەری زەوییـە کـە هونەرمەند (پۆڵ ناش) کێشاویەتی و وەک شکارتە گەنمی درووێنە کـراو و درەخـتی ریزکـراو دەیانبـینین و بە ئـاسـانیش ئەوە لێک

دەکەینەوە کە هونەرمەند بە جەمسەرە تیژەکانیانەوە سنووری بۆ داناون و چەمکێکی وای پێ داون کە لەمانا و چەمکی ساکاری کێڵگە و رووکەوە رەت دەکەن و وێنەکەی وا لێکرد، بەجۆرێک ئێمەی خستە قاوخێکی میتافیزیکی هێما ئامێزەوە کە ئەمەش لەو هەوڵە زیاتر نەبوو بە دوای پەیوەندییە ستاتیکییەکان، ئەوەی هونەرمەند لە کێڵگەدا هەڵی ئێنجابوون و بەو رەگەزانەش فۆرم پێک دێنن، کە لە هێڵ و سێبەر و رووناهییەوە بەدی هێنان.

ئەوەی چێژ لە کاری هونەری وەردەگرێ، کەراستەوخۆ لەبەرامبەر کارێکی هونەریدا دەوەستێ، نە بیر لە وردەکارییەکانی دەکاتەوە و نە بەو گەرمییەش بە پیریەوە دەچێ. ئەو هێزەی قایلی دەکا تەنیا کارە هونەرییەکەی بەرابەری و رادەی کارتێکردنیەتی.
ئەگەر بچینە سەر هونەرێکی دی، وەکو هونەری وشە، لەوانەیە بتوانین روانینەکە روون بکەینەوە، کەوا لە رادە و چۆنیەتی پەیوەندیی هونەرمەند بەبابەتێکەوە دەدوێ کە لەهۆشی ناوەوەیدا دای کردووە و گرنگی ئەمەش بۆ هونەرمەند لە داهێنانی کارە هونەرییەکەیدا مەسەلەکە یەکسان دەبێ ئەگەر بابەتەکە شتێکی هەست پێکراومان لە سرووشتدا بۆ بەرجەستە بکا، یا رووداوێک بووە و هونەرمەندی وروو‌ژاندووە و جۆشی داوە، یا کاری هونەرمەندێکی دیکەی بەدڵ بووە، ئەمانە بە ئاشکرا لە هەموو کارێکی هونەری مەزندا دەبینین.

پێش ئەوەی بەڵگەی ئەو مەبەستەش بە چەند دێڕە شیعرێکی

(T.S Eliot)ی شاعیر لە قەسیدەکەی (پیاوە بۆشەکان) دا بێنینەوە، ئێمە ناتوانین تیۆری شاعیر وەلابنێین کە پێی گوتوە Objective correlative پەیوەندی بابەتی ئالوگۆڕاکراو- مەبەستیشی لە پەیوەندی هونەرمەند بەشتێکی ترەوەیە کە لەکاتی داهێناندا لەگەڵی دابووە و لێی جیانەبووتەوە.
دێرە شیعرەکانی ئێلێیێتی شاعیریش ئەمانەن:

Here we go round the prickly pear.
Prickly pear, prickly pear.
Here we go round the pricklye pear
At five ’oclock in the morning.

لە هەندێ چاپدا سەیر دەکەین ئەو دێرانە بە تیپی لار لە چاپ دراون بەوەی لە قەسیدەکە جیاوازن(*) "
چونکە زۆری نەماوە ببێ بەو گۆرانییە میللییە ئینگلیسیەی منداڵی ئنیگلیس نییە وێردی سەر زمانی نەبێ. گۆرانییەکەش دەڵێ:

Here we go round the mulbery bush.
The mulbery bush, mulbery bush.
Here we round the mulbery bush.
So early in the morning.

ئەمە دزی نییە، چونکە هەر ئینگلیسێک ئەم گۆرانییە دەزانێ. خواستنیش نییە، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا وشەکان زۆر لێک نزیکن و یەک ئاهەنگیان هەیە، دیسان لە نەغمەشدا پێک

---

* بۆ نموونە بڕوانە- **selected poems** چاپی نیویۆرک قەسیدەی **The Hollow Men** لاپەڕە 79 "وەرگێڕ"

دەچن.. بەڵام لەمـــانادا تەواو جـــیـــاوازن. ت-س- ئیلیـــۆت، وێنەیەکی میتافیزیکی بەو ئاهەنگە سادە و مانا ساکارەوە داوە کە لە ژان و مـاندوویەتی مرۆڤـەوە دەدوێ چونکە prickly pear جـــۆرە هەنجـــیـــرێکی دڕکـــاوییـــە (*)" لە بیـــابانە وشک و چۆڵەوارەکانیشدا نەبێ نییە، بەڵام mulbery bush دەرختۆکەی ئینگلیسین و لە باخچەی هەمووماڵێکی ئینگلیسدا دەڕوێن.

بەم جۆرە قـالّبی -کۆ- کە لە گۆرانییـیە میللییەکەی منداڵاندا هەستـی پێ دەکـەین دەربارەی درەخـتـۆکـەکـە بوو، بەوەی ئەو هەسـتـەمـان وەبەر بێنێ کـە هەمـوو مـرۆڤـایەتی لە بیـابانێکی وشکدا دەسـووڕێـتـەوە، بە دەوری درەخـتـێکی دڕکـاویی- وشک دەخولێتەوە کە نە (بەر)ی هەیە، نە سوود.. هەموو مرۆڤایەتی لە سەعات پێنجی بەیانیدا بەبێ ئامانج دەخولێتەوە! لەکاتێکدا دەبێ خەڵکی لەو وەختەدا نووستبن. کەواتە ئیلـیـیەت، توانی شتـێکی سادە بگرێ و بەسـەرەقەڵەمێکی سادەشەوە، شتـێکی قـووڵ و کـارێکی مـەزن دابهـێنێ، تەنانەت کـارەکـە لە مـوجـیـزە نزیک بووەتەوە! ئا ئەمـەیە پەیوەندی بابەتی، ئەمەشـە کـە ئێـمـە دەمانەوێ.

هەمـــوو کـــارێکی هونەری نوێ و مـــەزن ســـەرچاوەیەکی هەیە، ئەگـــەرنا هونەرمـــەند لە کـــوێی دێنێ؟ هەر دەبێ شـــتـــێکی هەسـتـــپـــێکراوی لە دەســـتـــدا بێ ئینجـا ســـەرلەنوێ بێ پێـکی

* لە کوردیدا پێی دەڵێن (سەرکەتەشی) یان (شەکرۆکە) - وەرگێڕ

بێنێتەوە.
ئەوەتانێ پیکاسۆو هونەرمەندی دیکەی وەک ڤان کوخ و دێلا کرواو[35] یشمان دی کە کاری هونەرمەندەکانی پێش خۆیانیان دیوە و جارێکی تر بەپێی شێوە و روانینی خۆیان دایدەڕێژنەوە، ئەمەش نە لە کارەکەی پێشوو و نە لەو کارەی کە هونەرمەند دایڕشتووە کەمتر نییە.

هەمیشە سەرم لەو مەسەلانە سوڕ دەمێنێ کە تایبەتن بەو تاقیکردنەوانەی بەسەر بینەردا دێن کاتێ دەڕوانێتە وێنەیەک.
من خۆم بەو سیفەتەی نیگارکێشم، ناکرێ هەستی خۆم بەرامبەر کارێکی هونەری لەگەڵ هی کەسێ دەست لە هونەر نادا، بەڵام کە تێیەوەڕادەمێنێ، چێژی لێ وەردەگرێ، بە یەک چاو تەماشا بکەم.
جا ئەگەر ئەو کارە هونەرییەی بابەتێکی بەخۆوە گرتووە، هەروا ماوەیەکی زۆر لە رێگای وەسفی ئەو بابەتەوە گفتوگۆی لەسەرکرا، باشە دەربارەی ئەو وێنانە چۆن کە وا دەردەکەون پەیوەندییان بە هیچ شتێک نییە؟ باشە ئەدی ئەبستراکت چۆن؟ ئایا ئەو جۆرە وێنانە پەیوەندییان بە واقیع و بە ژیانەوە هەیە؟
لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ: چونکە یاساکانی ئاهەنگ و هاوسەنگ بوون و ململانێی نێوان تەبایی و ناکۆکەکان لە یاساکانی ژیان و پەیوەندیی نێوان مادده و بوونەوەر وەرگیراوە و لەسەریاندا بنیات نراوە.

دیسان وێنەی ئەبستراکت هەرچەندی نوقمی عەنتیکەیی و لێڵی

بێ، کـــەم تا زۆر پەیوەندی بەژیان هەر هەیە، یا بە وێنەیەکی دیکەی ئەبستراکتی، یا خودی بابەتەکەوە هەیە. مەحاڵیشە ئێمە سـەیری وێنەیەکی ئەبسـتراکـتی بکەین، بێ ئەوەی بە شـتـێکی هاوشێوەی ببەستینەوە.
ئیـتر بینەر بیرەوەریەکانی دەخاتە کارو هەموو پەیوەندییە وێک چووەکـانـیـشی لە پێـشـدا کـۆ دەکـاتەوە کـە لە ژیاندا هەسـتی پێکردووە یا لەمــەوپێش لە وێنەیەکـدا بینیـــویەتی بۆ ئەوەی ئاسـانـتـر تێی بگا. ئەو وەخـتـە رەگـەزە تاکـانەکـە و شـتـە نوێیـە زیادکـراوەکـە دەدۆزێتــەوە کـە وێنەکـە وەبەری هێناوە، جـا وەک کارێکی هونەری یا ئەوەیە قبوڵی دەکا، یاخود رەتی دەکاتەوە.

جیـاوازیی بنچینەیی نێوان وێنەیەکی ئەبستراکتی و وێنەیەک کە بابەتێکی بینراوی بەخـۆوە گـرتووە ئەوەیە، وێنەی بینراو ئەو تاقـیـکردنەوە بینراوانەی بینەر دیویەتی لەلایدا نوێ دەکـاتەوە، ئەو تاقیـکردنەوانەی پەیوەندییـان بەهونەرەوە نییـە. بەڵام وێنەی ئەبستراکتی تەنیا ئەو تاقیکردنەوەیە لەلای بینەر نوێ دەکاتەوە کە لەگەڵ هەستی هونەری دایە بەبێ ئەوەی لێکیشی بکاتەوە، یا لە بەرەو رووبوونی ئەو تاقـیکردنەوە هونەرییـەی بەردەمی دووری بخاتەوە، راگیری دەکا.

ئینجا یا ئەوەیە قبوڵی دەکا، یاخود رەتی دەکاتەوە. ئەمەش رێی ئەوە نـاگـرێ بڵــێین ئەو وێنەیەی بابـەتێکی بینراوی تێـدایە لە پیـاوێکی بازاڕیی نزیکتـرە لە وێنەیەکی ئەبسـتـراکـتی، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار بە چەند تاقـیکردنەوەیەکی بەرهەستی وای

دەبەستێتەوە کە پێیدا ڕۆیشتووە، بە چەند مانایەکی ئەدەبی و چەند هێمایەک. بەشتی وا کە پەیوەندیی نە بە هونەر و نە بەکارە هونەرییەکەی بەردەمییەوە هەیە، ترسناکیەتی وێنەکەش لێرەدایە کە بابەتێکی بینراوی بەخۆوە گرتووە. بێ ئەوەی بەهایەکی شێوەکاریی ساغی هەبێ. وەک چۆن ترسناکیەتی وێنەیەکی ئەبستراکتیش لەوە دایە کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هونەرمەندی

•



**دەسکردێکی هونەرمەند ... ماتیس**
**وێنە ( 160 )**



**وێنە(161)**

**هیپییەکانیش ناڕەزاییان بەرامبەر بە شەڕی ڤێتنام دەربڕی**

بە واقیع و بە ژیانی تێدا نەبێ.

## هونەر پێویستییەکی مرۆڤایەتییە

مایەوە سەر ئەوەی لەو شتانە بدوێین کە هەمیشە پەیوەندییان بەو پرسیارەوە هەیە لە پێشانگاکاندا بەبەر گوێمان دەکەوێ:
ئەم وێنەیە مانای چییە؟ سوودی چییە؟ پەیوەندیی بە کۆمەڵەوە چییە؟
مەسەلەکە بە سووربوونی بینەر و هونەرمەند لەسەر(کەتەلۆک) توندتربوو.
سەیر دەکەین بینەر لەگەڵ یەکەمین هەنگاو لەهۆڵی پیشانداندا، هەوڵی دەست خستنی کەتەلۆک دەدا، وەک ئەوەی کەتەلۆک میکرۆسکۆپێک بێ پێیەوە دەتوانێ نهێنی و تەڵەسمەکانی کارە پیشاندراوەکان بکاتەوە.
زۆرجار ئەو چاپکراوانە بێ سوود دەبن و لەلایەنی تۆمارکردنەوە بەدەر هیچ کارێکیان نابێ، بەڵام بینەر سوورە لەسەر کەتەلۆک کە لە وێنەیەکەوە بۆ ئەوەی تر پەنای بۆ دەبا..

له راستیشدا کەتەلۆک له کۆمەڵه ناوێک زیاتر نییه که جێگای گاڵتەجارِیشه.. بۆ نموونه (قژ رەشەکه) و (سرووشتێکی کپ لەسەر کراسێکی شیندا) و..تاد.
بەمەش روانینی خۆی دیاری کردووه و مانای وەسفی و ئەدەبیشی به پێی ئەو ناوه بۆ دارِشتووه. وەک کەسێ گوێ بۆ پارچه مۆسیقایەک رابدێرێ و لەوەدا سەر نەکەوێ که وا له ئاوازەکه بکا، بگاته ناخییەوه.

بەبیری دێتەوه که ناوی پارچه مۆسیقایەکه شۆرِشی ژیانه، ئیتر وای به خەیاڵدا دێ مۆسیقاکه مستی به رووی ژیان و به رووی (با)وه کردووتەوه، ئیدی مۆسیقاکه بەپێی خەیاڵەکانی بەناخی دا شۆرِ دەبێتەوه و زۆر نابا پارچه مۆسیقاکه پرِ دەبێ له مانا ئەمەش هەڵەیه. چونکه بەدڵبوونی کارێکی هونەری پێویسته بەبێ هیچ کارتێکەرێک بێ، چوون هەر وەک ئەو زمانەی مۆسیقازان مامەڵەی لەگەڵ دەکا. زمانی دەنگ و چۆنیەتی جیاوازی و وێکچوونی پلەکانیەتی، هەر وایش ئەو زمانەی نیگارکێش مامەڵەی لەگەڵدایه. زمانی شێوەکەیه. که بەرەنجامی جیاوازی و وێکچوونی هێڵ و رەنگ و رووبەرەکانه.

بەڵام لەبارەی سوودی کارەکه و پەیوەندیی به کۆمەڵەوه:
ئەم پرسیاره لەم ساڵانەی دواییدا مەترسییەکی زۆری هێناوەته گۆرِێ، چونکه زۆر له هونەرمەندان وەک تەرزه پروپاگەندەیەک بۆ خۆیان یا بۆ نزیک بوونەوەیان له دەسەڵاتدارانەوه بەرهەمە هونەریەکانیان به دروشمی سیاسی بۆش دەبەستنەوه که هیچ

پەیوەندییەکی بەکاری هونەرییەوە نییە، جا لەگەڵ ئەو کارە دروستکراوەشدا، بۆمان نییە بایەخی ئەوەش وەلا بنێین. هونەری رەسەن بەشێوەیەکی گشتی یارمەتی مرۆڤ دەدا لە بەرەو پێشچوونی بۆ دابینکردنی ئەوەی پێی دەگوترێ عەدالەتی کۆمەڵایەتی.

لێ مگەڕێ هەوڵی ئەوە بدەم، ئەوەی لێک بدەمەوە، ئەوەی کە دەتوانم ناوی لێ بنێم بەهەڵەداچوون لە تێگەیشتنی پرسیاری، "وێنە چ پەیوەندییەکی بەکۆمەڵەوە هەیە"دا. واتە باسی ئەو روانینە بەهەڵەداچووانەی ئەم کێشەیە بکەم.

ئەمن کە بۆ پیشانگایەک دەچم، ئەوهای چاو لێناکەم، دەچم لە کۆبوونەوەیەکی سیاسی، یا لە کۆڕێکی دەربارەی گیروگرفتەکانی کۆمەڵ ئامادە دەبم، لەو باوەڕەش دانیم کەسێ هەبێ پێش ئەوەی بچێت وێنەکان ببینێ ئەم جۆرە پێشبینیانە بکا. کەواتە ئەم پێک بەستنەوە راستەوخۆیە بۆچی؟ بەتایبەتیش کەسێ نییە بتوانێ بڵێ، بە درێژایی ئەو چەند سەدەیە وێنەیەک یا پەیکەرێک هۆی راستەوخۆ و لەباربووبن و دەسەڵاتدارانی ناچار کردووە بۆ ئەمیریکردنی زەوی، یا پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی پتر بۆ تاقەکەسی ناو کۆمەڵ.

ئەوەی لەبارەی گرنگی هونەرەوە بە گوێرەی کۆمەڵ مەبەستمان بێ، بەم رێگا راستەوخۆیە نایەتە دی، بەڵکو دوای تێگەیشتنێکی قووڵی زمانی شێوەوە دێ کە کارە هونەرییەکەی

لەسەر دادەمەزرێ.
ئینجا پاش ئەوەی کارەکە قبوولّ دەکەین و تێیەوەڕادەمێنین وازی لێ دێنین، لەکاتێکدا زۆر شتی تێگەیشتین کەلەوەوبەر نەماندەزانی. واتە بینینی ئەو کارە شتێکی خستە سەر دەستکەوتەکانمان دەربارەی بەها راست و جوانەکان.

ئەو رەنگ و بۆشاییانەی دلّمان پێیان دەکرێتەوە، کاتێ هونەرمەند دێ بۆمانی لەسەر رووبەرێکی بەتالّ دادەنێ، تێگەیشتنمان بۆ تەواوکاری و یەکێتی بەرزی و نزمییەکانی ژیان زێتر دەبێ، بە واتایەکی دی و بە ئاستێکی قوولّتری بیرکردنەوە، مەبەستم لەوەیە کە ئێمە دوای بەجێهێشتنی وێنەکە رێبازی هونەرمەند خۆیمان بۆ بینینی جیهان لەبیری خۆمان هەلّگرتووە کە بە شێوازی خۆی (بۆ نموونە لەکێشانی وێنەی درەختێکدا دەری بڕیوە)، چونکە شێوە و هێلّ و بۆشایی و رووبەرە پڕکراوەکان و رووناهیی و سێبەر، ئەمانە هەمووی هۆی ئەوەن هونەرمەند بە رێگای تایبەتی خۆی، دەربارەی روانینی بۆ جیهان و تێگەیشتنی ژیان دەریان دەبڕێ.

ئێستا دەگەینە پرسیارێکی دی، ئەویش ئەوەیە ئێمە بۆچی بایەخ بە رێباز و روانینی تایبەتی هونەرمەند دەدەین لە سەیرکردنی شتەکاندا؟
جا ئەگەر ئەو روانینە بە گوێرەی ئێمە، ئێمەی نیگارکێش بایەخی هەبێ، باشە ئەدی بۆچی مایەی شادی هەموانیشە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە ترسی نەزۆکیمان لەلا کەم دەکاتەوە کە لە ناخماندا

هەستی پێدەکەین، یان چلۆنایەتی روانینەکانمان بە ڕێگایەکی تایبەتی پتر بە ژیانمان دەبەستێتەوە؟
سەنگتراشی رۆمانی هەستی بێ هاوتایی و جوانی و ویقاری لەشی مرۆڤی لا پتر کردین کە ئێمە لە ژیانی ئاسایی رۆژانەماندا هەستی پێناکەین. (رامبرانت)یش لە ململانێی درامی سێبەر و رووناهی نێو وێنەکانی هەستی ئازایەتی ئەدەبیمان وەبەر دێنێ.
(ماتیس) یش بە رەنگ و هێڵی دیارییەوە پەرە بە بایەخە هەستییەکانمان دەدا.

هەموو ئەو نموونانە بۆچوونی تاقەکەسن و لەوە تەسکترە حەقیقەتی تەواوی هونەری تێدابێ، دیسان تاقە کارێک - تارادەیەک دەتوانێ هەستی جیاجیای چەند کەسێک پەرە پێ بدا.
ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ ئەوەیە، هەر کارێکی راستگۆ و سەرکەوتوو، کاتێ سەیری دەکەین روانینی نوێمان تیا نوێ دەکاتەوە. ئارەزووی ژیانمان لا نوێ دەکاتەوە، ئینجا مەرجیش نییە ئەو کارە شاباش بۆ گەشبینی لێ بدا، چونکە هونەری رەسەن بەشێوەیەکی گشتی ئەو ئارەزووەمان لەلادا نوێ دەکاتەوە بەکاری پڕ کارەساتی کەسێکی تراژیدیشەوە.

بابەتەکەش ئەو ئارەزووەمان ناداتێ، بەڵام چۆنییەتی چارەسەرکردنەکە خۆی، ئەتەمی کارە هونەرییەکە، رێبازی هونەرمەند لە بینینی بابەتەکەیدا.
بۆ نموونە روانینی (گۆیا) دەربارەی قەسابخانە ئادەمییەکان

ئەوەمان پێ دەڵێ کە پێویستە ژیانی چاکتر و لەبارتر و شەریفتر بژین کە ئەم قەسابخانانەی تێدا نەبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کۆمەڵە تابلۆیەی قەسابخانەی ئادەمی دەردەبڕن، بەهیچ جۆرێک هەستی نائومێدی و خۆبەدەستەوەدانمان بۆ هیچ زۆرداریێ ناداتێ، بەڵام داخۆ هەموو کارێکی هونەری گوڕی ژیانمان پێ دەدا؟

بەشێوەیەکی گشتیش دەتوانین کاری هونەری لە دوو جۆرە بیرکردنەوەدا ببینین، لەگەڵ ئەوەی (وەک وتیشمان) هونەر بە گشتی وامان لێدەکا هەست بەژیان بکەین، کاری وا هەیە هەستی زاڵبوونمان بەسەر واقیع دەداتێ لەگەڵ ئەوەی هەرچییەکی دیکەشمان پێ دەدا، وەکو کارەکانی (بیرۆدی فرانشیسکا) "36" و (مۆنتانیا)"37" و (پۆسان) "38" و (دیگا) "39".

کاری ئەو هونەرمەندانە بە چەشنێکی تەواو وامان لێدەکەن هەست بە چەمکی مرۆڤ و پەیوەندیی بە جووڵانەوە بکەین.

بەرهەمی دیکەش هەیە رێگایەکی دیاریکراوی بینینمان بۆ بەرجەستە دەکەن، وەکو کارە تەعبیرییەکانی گۆیا کە چەمکی هونەری تیا دەبێ بە دەربڕینی یاخیبوونی مرۆڤایەتی بەسەر هەلومەرجی دەوروبەریەوە.. بەرهەمەکە لە چوارچێوەیەکی تەعبیری بێ خلّتدا دەردەکەوێ و وا لە سەنعەتسازییەکە دەکا لە پلەی دووەمدا بێ. لەوانەیە بەدرێژایی رۆژگار هونەرمەندی تریش بەشداری لەمەدا بکەن، وەکو (ئالگریکۆ)"40" و (رامبرانت) و هی تر.. کە هەریەکێکیش کەسایەتی و شێوازی خۆیان هەیە.

ئێمە دەتوانین زۆر لەو هونەرمەندانە دەستنیشان بکەین کە بەرهەمەکانیان سووربوونی مرۆڤی لەسەر ئەوە تێدایە کە لە هەلومەرجی دەوروپشتی بەهێزترە، بەڵکو لەخودی رووداوەکانیش بەهێزترە، لەوانەش هونەرمەندان (تیتیان) و (دێلاکروا) و (ڤان کوخ).

ئەم دابەشکردنە لەوانەیە لە پێناسە باوەکە نزیک بێتەوە کە کارەکان دابەش دەکاتە سەر کلاسیک و رۆمانتیک، بەڵام خرگرەوە و فراوانترە، چونکە پابەندی قۆناخێکی مێژوویی دیاریکراو نییە، ئێمە نابێ بە وێنەی رۆمانتیکیەکی وەک دێلاکرواو شۆبان بڕوانینە ئالگریکۆ.

دەشێ یەکێ بلێ لە لێکدانەوەی روانینی خۆتدا دەربارەی ئەوەی هونەر هەستی ژیان و هیوامان لا دەخولقێنێ.. زیاد رۆیشتبی ئەمەش لە بیرو ئیستاتیکادا شتێکی تازە نییە.

بەڵام ئایا هەستی ئێمەش لە بەرابەر نیگارێکی (بیللینی)"41" دا هەمان ئەو هەستەیە کە دۆکی فەرمانڕەوای ڤینیسیا کاتێ بۆ یەکەمین جار ئەو نیگارەی بینی وهەستی پێکرد؟ نەخێر.. سادەترین نموونەش ئەمە بە رێگایەکی هەستپێکراوەوە دەچەسپێنێ ئەوەیە. لێدانی پارچە مۆسیقایەک لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێکی تر دەگۆڕێ، بۆ نموونە چۆنیەتی لێدانی کۆنشۆرتۆی کەمانی بتهۆڤن لەلایەن (هۆبرمان)ـەوە جیایە لەگەڵ لێدانی (داڤید ئۆستراخ) دا.

دۆکیش کە سەیری وێنەکەی بیللینی کرد پابەندی نەرێت و باوەڕی سەردەم و چینەکەی خۆی بوو و پشتی بە بیروباوەڕ و ئایدیالیزم و شارستانییەتی سەدەی شازدەم دابوو.
بەڵام ئێمە بە هەموو دەمارگرژیی و ململانێی ژیانمان لەم سەدەیەدا دەڕوانینە وێنەی دۆک، بە ڕێگایەکی دیالێکتیکی دیکە، روانینی ئێمە بۆ وێنەکە جیاوازە و لەسەر چەشنی ئەو ململانێیە دەوەستێ کە بەرەنگاری بووینەتەوە. هەروەها لەسەر چینی کۆمەڵایەتیشمانەوە. چونکە هەمیشە لەگەڵ هەر هونەرێکی رەسەندا شتێ هەیە روانین و بڕوامان بە ژیان نوێ دەکاتەوە و پێویستییە دەروونییەکانمان دابین دەکا.

هەموو هونەرێک گیانی ئەو سەردەمە و پێویستییەکانی بەخۆوە دەگرێ تێیدا لەدایک دەبێ، ئەمەش راستییەکە و حەفت و هەشتی لەسەر ناکرێ. بەڵام هەرچەندی هونەر پەرە بسێنێ بەهای پێکهاتنی چەسپاوەو ناگۆڕێ، ئەوەی دەگۆڕێ تەنیا دیوی دەرەوەیەتی، تاکو لەگەڵ کات و زروفدا هاوکوف بێ چونکە پێویستییە ماددی و دەروونییەکانی مرۆڤ و ئەنگیزەکانی چەسپاون.

هێشتا ئاهەنگی گشتیی گەردوون و ژیان وەک هەزاران ساڵ لەمەوبەرە، ئێستاش نیگاری پیاوەکەی پێشین کە بەسەر دیواری ئەشکەوتانەوەیە دەمانجولێنێ، لەگەڵ ئەوەی لە رواڵەتدا بەرهەمە هونەرییەکانمان جیاوازییەکی تەواویان لەنێواندا هەیە، ئایا (پۆسان) کە وێنەکانی لە سەدەی حەڤدەمدا کۆشکی

نەجیبزادەکانی فەرەنسای رازاندووەتەوە، دەیزانی وێنەکانی هیوای ژیان بە نیگارکێشێکی فەرەنسایی دیکە دەدەن لە سەدەی بیستەمدا، کە (فیرنان لیچێ) [42]ی مەزنە؟

لیچێ ئەوەی ئاشکرا کرد و وتی: کە پێکهێنراوەکانی پۆسان بڕوای بەچینی چەوساوە پتەوترکرد بەهۆی ئەوەی (فیرنان لیچێ) بەرهەمەکانی پۆسانی لەرێی بڕوای ئەوەوە بەچینی چەوساوەدا دی، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە هونەری پاشڤەبڕ-سلبی- و پێشڤەبڕ- ایجابی- نییە."

هەروەها هونەرێ نییە هێزی نزم بچەسپێنێ و هی تریش هێزی هەڵچوو. مەسەلەی هونەر مەسەلەی مرۆڤایەتییە و پەرەسەندنیشی پەرسەندنی کۆمەڵە.

ئا ئەم چەرخەی ئێمە کە بە ململانێی ملیۆنەهاوە دەناسرێتەوە، ئێمە لەم چەرخەدا تەنیا دەتوانین نهێنیە زۆر و زەبەندەکانی هونەری تیا بدۆزینەوە، بەمجۆرە ئیتر شی دەکەینەوە و دەیپاڵێوین و بە روانینێکی زانستیانەی نوێ و ساغەوە لێکی دەدەینەوە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ ئێمە مەبەستمان لەوەیە سرووشتی هونەر دەگۆڕێ، یاخود رەگەزەکانی فۆرم Form بە بەریانەوەیە نوێ ببنەوە.

## دیماهی

له تاریکترین ساتدا مرۆڤ هەست بە هونەر دەکا..
وەک ئەوەی خۆشەویستێک دەستی بگوشێ..
وێنەی شاباش بۆ ژیان لێدان دژ بە هێزە لەناوبەرەکان..
بۆیە هەرچەندی هونەرمەند وا پیشان بدا لە ڕووداوەکانی دەوروبەریەوە بەدوورە، ئەمەی هەرگیز وەک هەڵوێست وەرگرتنێکی بێ لایەن لێ وەرناگیرێ.
چونکە هونەرمەند کە ڕووداوەکان ڕەت دەکاتەوە لەو ئاژەڵە دەکا ژیانی بۆ خۆراکێکی ژاراوی دەوێ..
هونەرمەند لە ڕەتکردنەوەشیدا دەیەوێ مانا فراوان و جاویدانەکەی مرۆڤایەتی بچەسپێنێ..
ئەمەش هەڵوێستێکە لەپێناوی ژیان خۆیدا..

# پەراوێز

(1) کلێ – klee-
پۆل کلێ– هونەرمەندێکی ئەڵمانییە، بەڵام لە سویسرا لە دایک بووە. یەکێکە لە پێشەنگەکانی ڕێبازی ئەبستراکت، هونەری کلێ هونەرێکی نوێیەو دەشێ بڵێین چاوی پێ ڕانەهاتووە. سەبارەت بەوەیشەوە لە یەکەم نیگادا حیسابێکی بۆ ناکەین، تەنانەت لەوانەیە بە قەڵەمکێشی منداڵێکی بزانین، بەڵام کە بە وردی لە کارەکانی خورد دەبینەوە دونیایەکی شاراوەی لە پاڵدا دەبینین.
کلێ دوژمنێکی سەرسەختی نازییەکان بوو، هەر لەبەر ئەوەش ئەڵمانیای بەجێهێشت.

(2) کاندنسکی – kandinsky
ڤاسیلی کاندنسکی، پێشەوای ڕێبازی ئەبستراکت، لە مۆسکۆ لە دایک بووە، تەمەنی منداڵیی لە ڕۆما و فلۆرەنسای وڵاتی ئیتاڵیادا بەسەر بردووە، پاشان گەڕاوەتەوە مۆسکۆ و چووەتە بەر خوێندنی یاساو ئابووری سیاسی.
کاندنسکی دەیویست هونەری خۆی لە مۆسیقاوە نزیک بکاتەوە بەوەی لە لاساییکردنەوەی سرووشت و حەقیقەتە مادییەکان دوورکەوتەوە، بەمەش پێی وابوو لە دەربڕینی حەقیقەتەکانی دەروون و ناخەوە نزیک دەبێتەوە.

(3) هاربرت رید

رەخنەگرێکی هونەریی بەناوبانگی ئینگلیسییە، لە 1893دا لە شاری یۆرکشایری ئینگلستان هاتووەتە دونیاوە، منداڵییەکی گۆشەگیر و دوورپەرێزی بەسەر بردووە.

رید هەوەڵ جار بە شیعر دەستی پێکرد، تەنانەت کۆمەڵە شیعرێکیشی لە وەختی سەربازیدا بڵاوکردەوە، پاشان لە شاری لیدز سەودای هونەری کەوتە سەر، لەوێ گۆڤاری (هونەر و پەیام)ی دەردەکرد و سەرەتای نووسینەکانیشی هەر لە رێی ئەو گۆڤارەدا بڵاوبوونەوە. ساڵی 1971 کۆچی دوایی کردووە. ئەو دەمە سەرنووسەری گۆڤاری (ئیستاتیکا و رەخنەی هونەری) بوو.

(4)مۆندریان mondrian

پیت مۆندریان mondrian یەکێکە لەو سێ هونەرمەندە بەناوودەنگەی هۆڵەندا- رامبرانت و ڤان کوخ و مۆندریان- ساڵی 1872 لە شاری ئامرسفورت لە دایک بووە: مۆندریان-یش بە پێشەنگێکی دیکەی -رێبازی ئەبستراکت- دەژمێردرێ و پێشەنگی (ئەبستراکتی ئەندازەیی)شە. ئەم رێبازەش زیاتر بایەخ بە دەربڕینی ئەندازەیی دەدات و لە هێڵی چەماوە دوور دەکەوێتەوە.

بەرای ئەو تابلۆی هونەری بۆشاییەکی پان و لووسە و ئەو هێڵ و فۆرم و رەنگانەی بەسەریدا دەڕۆن پێکهاتەیەکن لەگەڵ هۆشدا تێکەڵ دەبن.

(5) بارۆک

شێوازێکی هونەری بووە لە ئەورووپا لە نێوان ساڵانی (1600-1750) زاراوەکەش- بارۆک- لەلاتینییەوە هاتووە کە (دژ بە چەشە، یا غەریب) دەگەیەنێ و تەنیا شیعر و فەلسەفە و مۆسیقای نەگرتبووەوە، بەڵکو لە هەموو کارێکی ئەو چەرخەدا خۆی نواندبوو و بۆیە ئەو چەرخە بە -بارۆک- ناونرابوو.

دیارترین سیفەتی ئەو چەرخەش ئەوەبوو کە ئایین بە دونیا بەسترابووەوە.

(6) رۆکۆکۆ rococo

شێوازێکی هونەریی بوو لە نێوان ساڵانی (1730-1780) بەسەر هونەری ئەورووپادا سەپا بوو.

وشەی (رۆکۆکۆ)ش لە زمانی فەرەنسییەوە وەرگیراوە، وەکو شێوازیش بەوە دەناسرێتەوە کە شێوازێکی زەخرەفە ئامێز بوو لە هونەردا.

(7) پلیخانۆف plekhanov

جیۆرجی ڤالنتینۆڤیچ پلیخانۆف- رووناکبیر و شۆڕشگێڕێکی رووسە، دامەزرێنەری بزووتنەوەی دیموکراتی سۆشیالیستییە لە رووسیادا، بەشداری زۆریشی لە پەرە پێ سەندنی تیۆری زانستی کردووە.

دوابەدوای سالّی 1903بوو بە لایەنگیری مەنشەفیەکان، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا تا دوا ژیانی دلّسۆزی چینی کرێکار بوو و لە مەسەلە راستەکان لای نەدا.

(8) لاڤرۆڤ lavrorich

نەک (لۆفافر) وەک لە کتێبەکەدا هاتووە کە زیاتریش لەوە دەچێ هەلّەی چاپ بێ.

ناوی تەواوی (پیتەر لاڤرۆڤیچ لاڤرۆڤ)ـەو بنیاتنەری قوتابخانەی خود- زات-ی رووسییە لە زانستی سۆسیۆلۆژیادا.

لاڤرۆڤ دەربارەی فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیا نووسیویەتی

بڕواشی بە تیۆری سۆشیالیزم هەبوو لە ولاّتە سەرمایەدارەکانی ئەورووپا و گومانی لەوە هەبوو کە لە رووسیادا سەربگرێ.

(9) ئیزنیشتاین

دەرهێنەرێکی سینەمایی بەتوانای رووسە و لە دەرهێنەرە بەناوبانگەکانی دونیایە و زیاتریش بە فلیمەکەی (زرێپۆشی پۆتمکین) ناوبانگی دەرکردووە.

(10) جاکسۆن پۆلۆک

هونەرمەندێکی ئەمەریکاییە، سالّی 1912 لەدایک بووە. ئەوەی پۆلۆک لە هونەرمەندانی دی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە پۆلۆک رەسمی بە فلّچە نەدەکرد، بەلّکو لە دووررا بۆیەی دەرشتە سەر تابلۆ یان قوماش بێ ئەوەی دەستی بداتێ، یا فلّچەی بگەیەنێتێ، لەوانەیە هەبن ئەم رێگەیان گرتبێتەبەر، بەلاّم هیچیان وەکو پۆلۆک تێیدا سەرنەکەوتوون، ئەم هونەرمەندە لە سالّی 1956 بەرِووداوێکی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کرد.

(11) ئیمامی غەزالی

مەبەست لە ئەبوحامیدی کوڕی محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەدی غەزالییە کە فەیلەسووفێکی ناسراوی موسلّمانە.

(12) ئێنیشتاین Einthoven
زانای بەناوبانگ ئەلبێرت ئێنیشتاین- فیزیک زانێکی ئەمەریکاییە- ساڵی 1860 لە ئەڵمانیا لەدایک بووە.
لە ساڵی 1916 دا - تیۆری نیسبی- تایبەتی و گشتی داناوە.
لە ساڵی 1921 پاداشتی نۆبڵی وەرگرتووە.

(13) هیراکلێتس (Heraclitus)
فەیلەسووفێکی ماتریالییە و لەدیالاکتیک خوازەکانی گریکە، لە دەوروبەری ساڵی 544ی پ. ز لە دایک بووە، تا دەوروبەری 483ی پ. ز ژیاوە.
هیراکلیتس لەو باوەڕەدا بوو کە ئاگر یەکەمین ماددەی سرووشتە، چونکە لە هەموو ماددان زیاتر توانای گۆڕان و جوولانەوەی هەیە. پێی وابوو هەموو دونیا لە ئاگر پەیدا بووە.

(14) ئاندرێ جید
ڕۆماننووس و ڕۆشنبیرێکی فەرەنسییە، لە ڕۆمانە بەناوبانگەکانی- ئەشکەوتەکانی ڤاتیکان.

(15) چارڵس ڕۆبرت داروین
زیندەوەرزانێکی بەناوبانگی ئینگلیسە، ساڵی 1809 لەدایک بووە.
داروین بنیاتنەری تیۆری پەرەسەندنی مێژوویی دونیای ئۆرگانە، نووسراوەکەی (نەژادی چەشنەکان) بەناوبانگترین لێکۆڵینەوەیەتی.

(16) ژان باتیست لامارک
زانا و سرووشتناسێکی فەرەنسییە، لە ساڵی (1774)دا لەدایک بووە.
لامارک یەکەمین تیۆری خڕگرەوەی پەرەسەندنی رووەو باڵای دونیای زیندەوەرانی دانا، کە داروین لە تیۆرەکەی خۆیدا سوودی لێ وەرگرت.

(17) بێرگسۆن - bergson
فەیلەسووفێکی ئایدیالیزمی فەرەنسییە، نوێنەری ڕێبازی- زەین روونیە، لە 1859 دا هاتووەتە دنیاوە.
بێرگسۆن باوەکو هیچ کتێبێکی تایبەتی دەربارەی جوانی یا هونەر نەنووسیوە، بەڵام

کارێکی دیاری کردۆتە سەر هونەر و ئیستاتیکا، تەنانەت (هاربرت رید)یش شوێن پێی ئەوی هەڵگرتووە.
بێرگسۆن لای وایە کە دوو بۆچوونی جیاواز بۆ شتان هەیە، بۆچوونێک ئەوەیە کە پێویستە بە دەوری شتەکاندا بخولێینەوە و بۆچوونێکیش وا پێویست دەکا بچینە ناو ناخیانەوە.

(18) چارلز ساندرز پێرس
فەیلەسووفێکی ئەمەریکاییە و دامەزرێنەری رێبازی (براگماتییە).

(19) ئەبستراکت Abstract
ئەبستراکت کە وەک رێبازێکی هونەری سەری هەڵداوە، رێبازێک نییە لەم دوادواییانە هاتبێتە گۆڕێ بەڵکو دەگەڕێتەوە ساڵی 1910 ئەو دەمەی هونەرمەندی رووسی-کاندنسکی یەکەمین کاری خۆی پیشاندا، بەدوای ئەویش هونەرمەندان مالڤیچ و مۆندریان. کاندنسکی بەدوای جوولانەوەیەکی سەر بەسۆز و دراما ئامێزدا دەگەڕا..
ئەوەی راستییە باڵە چەپڕەوەکەی کیۆبیزم و سریالییەکان بەشدارییان لەدەرکەوتنی ئەم رێبازەدا کرد، لەوانەش هەوڵی هونەرمەندان پیکاسۆ و مارک و پۆل کلێ.

(20) ئایندەخوازی Futurism
رێبازێکی هونەرییە و لە نێوان ساڵانی 1909 و 1911 دا لە ئیتاڵیادا سەری هەڵدا. دامەزرێنەر و ئاگرخۆشکەری ئەم رێبازەش شاعیری ئیتاڵی فلیپ تۆماس مارێنتی بوو.
ئایندەخوازەکان بە بۆچوونەکانیان کە لە بەیاننامەکەشیاندا بەچاکی دەردەکەوێ، ویستیان نەمرییەک بە دینامیکایەتی پیشەسازی بدەن و داوای ئەوەیان دەکرد کە دەبێ کاری هونەری و ئەدەبی گیانی سەردەم دەربڕێ.
ئەم رێبازەش زێتر لەنێو لاوەکاندا پەرەی سەند و لەبرەو دابوو، بەوەی لاوەکان بە بزاف و لەگوڕ و بەجۆشترن.
لەوانەی بانگی ئەم رێبازەشیان لە رووسیادادا، مایکۆفسکی شاعیر بوو.

(21) کۆبیزم Cobism
قوتابخانەیەکی هونەرییە، لە فەرەنسادا لەسەردەستی هونەرمەندان جۆرج براک (1881-1972) و پاپلۆ پیکاسۆ (1881-1973)دا دامەزرا.
ئەم قوتابخانەیە بە چەند قۆناخێکدا تێپەڕی، لەو قۆناخانەش دەتوانین دوو قۆناخی

سەرەکی دەستنیشان بکەین:
یەکەمیان: قۆناخی شیکردنەوە کە بریتی بوو لە گەڕاندنەوەی شێوە بۆ قەبارە بنەڕەتییەکانی، دووەمیشیان: قۆناخی ئاوێتەکردن یان پێکهێنان، لەم قۆناخەدا بە پێچەوانەی قۆناخی یەکەم جارێکی تر گەڕانەوە سەر واقیعی شتەکان، ئەوەی لەم ڕێبازەدا دەرکەوتووە ئەوەیە کە کۆبیزمەکان ئەوەندەی بایەخیان بە بیناکاری ئەندازەیی دەدا، ئەوەندەیان بایەخ بە ڕەنگ و جوانکاری دیکە نەدەدا.

(22) ژان ئارب – Jean arp (1966–1887)
شاعیر و سەنگتراش و نیگارکێشێکی فەرەنسییە و یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ڕێبازی دادیزم.

(23) هێنری مۆر Moore
سەنگتراشێکی –نحات– هاوچەرخی ئینگلیسە. مۆر توانی بەشێوازی خۆی لەسەنگتراشیدا تەنگ و چەڵەمە و کێشەکانی ئەم چەرخە هونەرمەندانە دەربڕێ.
لەگەڵ ئەو مۆرکە کارەساتاویانەی هونەرەکەشی هەر لەبەرچاو خۆش دێت.

(24) جیۆتۆ Giotto (1337–1266)
هونەرمەندێکی ئیتاڵییە، بەرلەوەی خۆی بۆ هونەر تەرخان بکا شوان بوو، بەڵام دوای ئەوە چیمابۆی هونەرمەند دەیبینێ، دەیباتە لای خۆی.. تا لە پاشان ئەو هونەرمەندەی لێ دەرچوو کە وای لێ بێ لەباتی مامۆستاکەی و لەسەر داوای ئەویشەوە وێنەی نێو کلیسان بکێشێ.
جیۆتۆ بایەخێکی زۆری بە هونەری کاشیکاری داوە، ئەم هونەرمەندە زیاتر بە فریسکۆکانیەوە ناوبانگی دەرکردووە کە بەداخەوە گەلێکیان لەبەر بەهەند هەڵنەگرتنی بۆیەیان بەسەرەوە نەماوە و یا کاڵ بوونەتەوە.

(25) فرئانجیلکۆ FraAnjelico
جیدۆ جیۆڤانی داڤیزۆل کە بە فرئانجیلکۆ FraAnjelico ناسراوە. هونەرمەندێکی ئیتاڵی سەدەی پازدەمە. سەرەتا پیاوێکی ئایینی بوو، تەنانەت دەیویست وەکو مەسیح بژی. فرئانجیلکۆ لە کێشانی وێنەی دارو دەوەن و گوڵاندا تاکو بلێی وەستا بوو.

(26) جیۆڤانی چیمۆبوا Cimabue (1240. -1302)
یەکێکە لە هونەرمەندە ناودارەکانی سەدەی پازدەم، ئەوەی راستیشە زۆر کەس گومانی لە بوونی ئەم هونەرمەندە هەبوو، تا ئەوەی مێژوونووس و رەخنەگر- جۆرج ڤاساری- کتێبەکەی (ژیانی نیگارکێشە بەناوبانگەکان)ی بڵاوکردەوە.

(27) فرانچیسکۆ گۆیا
هونەرمەندێکی ئیسپانییە، ساڵی 1746 لە هەرێمی (ساراگوزا) هاتووەتە دونیاوە، لەسەردەستی -جۆزێی لۆزان- دا خوێندوویەتی کە لۆزانیش خۆی نیگارکێشێکی ئەکادیمی بوو.
لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم وەکو هونەرمەندێکی لێهاتوو و بە توانا ناسرا، یەکەمین کەسیش بایەخی بە گۆیا داو دەری خست (بۆدلێر)ی شاعیری بەناوبانگی فەرەنسی بوو. تابلۆی شەهیدەکانی مایس یەکێکە لە کارە بەناوبانگەکانی.

(28) رۆسکین (1819–1900):
سیسیۆلۆژیست و رەخنەگرێکی هونەریی ئینگلیسە، بەوە دەناسرێ کە داکۆکیەکی زۆری لەو جوولانەوەیە کرد کە پێی دەگوترێ پێش رۆفائیل Pre Raphaeglsme.

(29) ئاندرێ مالرۆ
جۆرج ئاندریێ مالرۆ، شاعیر و رۆماننووس و رۆشنبیری فەرەنسی، ساڵی 1901 لە گەرەکی مونمارتەری پاریس لەدایک بووە. لە رۆمانە بەناوبانگەکانی (داگیرکەران)، شایانی باسە ماوەیەک وەزیری رۆشنبیری بووە.

(30) ئیکسپرێشنیزم Expressionnisme
رێباز و قوتابخانەیەکی هونەرییە لە ئەڵمانیا و لەدەوروبەری ساڵی 1910 دا سەری هەڵدا و ئێکسپرێشنیزم (دەربڕین خوازی) یش رێگایەکە خرۆشانێکی لە رادەبەدەری هونەرمەندی پێوەیە، دیسان ئەوەی ئەم رێبازە لە رێبازە هونەرییەکانی دی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئێسکپرێشنیزم زیاتر پشت بەخود - زات-ەوە دەبەستێ، هەربۆیەش شێوازێکی یەکگرتووی نییە، بەڵکو ئەو هونەرمەندانەی سەربەو رێبازەن هەر یەکەو رێڕەوی خۆی هەیە کە لەگەڵ سۆز و خرۆشان وبیرکردنەوەی خۆیدا دەگونجێ.

(31) رامبرانت Rembrant
هونەرمەندێکی بلیمەتی هۆڵەندییە- ساڵی 1606 لەشاری لایدن هاتۆتە دونیاوە،

رامبرانت لەسەرەتادا کـارەکانی لە ژێر کـاریگەری کـاراڤاجیـۆدا بـوو، بەڵام لە پاشاندا پەرەی بە شێوازی خۆی دا.
ئەم هونەرمەندە بایەخێکی زۆری بە تاکەکەس دەدا، پاڵەوانی تابلۆکانیشی هەمیشـە لە نێـو کـۆمـەڵانی خـەڵکی سـادەوە هەڵدەبژاردن، بەرهەمـەکـانیـشی چەندی روون و ئاشکران ئەوەندەش قووڵن.

(32) جۆرجیۆ دی کیرکۆ
نیگارکێـشێکی ئیـتاڵیـیە و لە یۆنان لەدایک بووە، باوکی خەڵکی سکلّیا بووە، بۆ خوێندنی ئەندازە نێـردراوەتە شاری ئەسـینا، بەڵام کـیرکۆ لەسەر رێ و شوێنی باوکی نارِوا وخوو دەداتە نیگارکێشان.
بەم جۆرە دەچێتە ئەڵمانیا و فەرەنساش، لەو کاتەدا کە مشـتومڕێکی گەرم دەربارەی رێبازە هونەرییەکان لە گۆڕێ بووە.
(ئاپۆلینێر)ی شاعیری فەرەنسایی یەکێک بووە لەوانەی کارەکانی ئەم هونەرمەندەیان پەسەند کردووە و بەهونەرمەندێکی داهێنەریان لەقەڵەم داوە.

(33) ڤانست ڤان کوخ – Vangogh
بلیـــمـەتێکی دیکەی هوڵەندایە، سـاڵی 1843 لەشـاری کـروت زاندرت هاتووەتە دونیـاوە، ماوەیەک بـازرگـانی تابلۆ، مـاوەیەکـیش واعـیزی ئایینی بووە، بەڵام لەمـانە لەهیچیاندا سەرنەکەوت بەتایبەتیش لەهی دووەمیان.
ڤان کوخ لە رێگای هونەرەوە، ئێش و ژان و ژیانی تاڵی مرۆڤی دەردەخست، تا ساڵی (1890)یش ئەو ساڵەی خۆی تێدا کوشت هەر دڵسۆزی ئەو بەها و نرخە ئینسانییانە بوو کە خۆی بڕوای پێی بوو.

(34) هێنری ماتیس matisse
هونەرمەندێکی فەرەنساییە، ساڵی 1869 لەدایک بووە.
ماتیس لە ژێر کاریگەری (سیزان)دا بوو، گەلێک شێوازیشی لە نـیگارکێشاندا تاقی کردەوە، تا ئەوەی لە دواییدا لەسەر رێبازی (فۆڤیزم Fauvism) سەقامی گرت.

(35) ئۆجین دێلاکروا Delacroix
هونەرمەندێکی نـاسراوی فـەرەنسـاییە و بە رەمـزی رۆمـانتـیسـیزم لەقـەڵەم دەدرێ. ئەم هونەرمـەندە لە ژیانیـدا دووچاری گـەلێک نەخـۆشی و سـەرئێشـان بوو و کـەبوو بەهۆی ئەوەی گـۆشەگـیر بێ، لەکـارە بەناوبـانگەکـانی–سردنانبـال– و ئازادی پێشـەوای گـەل

دەکا.

(36) بیرۆدیلا فرانچسکا (1416-1492).
نیگارکێشێکی ئیتاڵییە- لەکارە بەناوبانگەکانی فریسکۆی زەخرەفەیی کلێسای (سان فرانسوا)یە.

(37) ئاندریا مانتنیا
نیگارکێشێکی سەرەتای سەردەمی رێنیسانسە. لە شاری پادۆڤای باکوری ئیتاڵیادا گەورە بووە، زۆربەی کارەکانیشی سرووشتی باکور رەنگ دەدەنەوە. هونەری مانتنیا لە قاوخێکی مێژوویی و ئەفسانەییدا خۆی دەنوێنێ.

(38) پۆسان Poussin
فەرەنسایییە، بەڵام نزیکەی هەموو تەمەنی لە ئیتاڵیادا بەسەر بردووە. هونەری پۆسان بە سۆزێکی لەرادەبەدەر و شێوازێکی ورد دەناسرێتەوە، تەنانەت هەندێ لەکارەکانی وێنەی کۆڵراوێک دێنە بەرچاو.

(39) دیگا (1834-1917)
هێلیر جێرمان ئیدگاردیگا، هونەرمەندێکی فەرەنسایییە و لە شاری پاریس لەدایک بووە.
سەیر لەوەدایە ئەم هونەرمەندە چێژی لە ژیانی پڕ ژان و دەردەسەری خۆی وەردەگرت.
هەر لە منداڵییەوەش پێشبینی ئەوەی کرد کە زۆر ناژی، بەڵام بە پێچەوانەوە پێشبینیەکەی راست دەرنەچوو تەمەنی لە (80 ساڵ) تێپەڕی. نووسەری بەناوبانگ گی دو موپاسان دەڵێت: دیگا وێنەی ژیانی بە چەشنێک کێشا کە من دەمویست وێنەی بکێشم.

(40) ئێلگریکۆ - Elgrco
تمیتۆ کۆبۆلی کە بە ئیلگریکۆ ناوبانگی دەرکردووە خەڵکی (دورگەی کرێت)ی وڵاتی گریکە. چووەتە ئیسپانیا، لەکاتێکدا کە بووژانەوەی مەسیحیایەتی کارێکی زۆری کردە سەر سەرهەڵدانی هونەری ئیسپانی، هەر لەو کاتەشدا ئیلگریکۆ تابلۆ بەناوبانگەکەی (مەسیح جامبازەکان لەپەرستگادا دەردەکا)ی دروست کرد.

(41) جیۆڤانی بێللینی (1435-1516).
هونەرمەندێکی ئیتاڵی مەزنی (چەرخی ڕێنیسانس)ە، مامۆستایەکی مەزن بووە، گەلێک هونەرمەندی پێگەیاندوون.

(42) ڤیرنان لیچێ
جووتیارێکی نۆرماندی بوو، لە ساڵی 1881 دا لە دایک بووە. لیچێ بێ ئەوەی تۆێشویەکی ڕۆشنبیری وای پێ بێ هاتە سەر ڕێگای سەختی هونەر، بەڵام بە زەین ڕوونی وعیشقێکی لە رادەبەدەرەوە ڕێگای گرتە بەر.
ئەم هونەرمەندە لە پێشەوەی ئەو هونەرمەندانەیە کە ئامێر و دروستکراوە پیشەسازییەکانی هێنایە نێو هونەرەوە.

- وەرگێڕ -
1984

تێبینی: لە نووسینی ئەم پەراوێزانەی سەرەوەدا ،سەیری ئەم سەرچاوانەش کراوە
وەرگێڕ

* الفن عبر التاریخ- عفیف بهنسي- چاپخانەی الجمهوریە- دمشق.
* الموسوعة الفلسفیة- م. روزنتال و - یودین- دار الطلیعة- بیروت.
* حاضر الفن ـ هاربرت رید- دارالحریة- بغداد.
* قصة الفن الحدیث- سارة نیومایر- تعریب رمسیس یونان.

•




**ڕووپەڕی بەرگی یەکەم چاپی یەکەم 1986**




**رووپەری بەرگی یەکەمی چاپی یەکەم 1986**



هونەرمەند فرا ئەنجلیکۆ



**هونەرمەند رافاییل**



**هونەرمەند ئێدوارد دیگا**



**هونەرمەند سۆفی ئەندرسن**



هونەرمەند جۆن ولیەم گۆدوارد



هونەرمەند ئێدوارد بۆرنێ



هونەرمەند جۆن ولیەم وۆتەرهاوس



هونەرمەند پۆڵ رۆبنس



هونەرمەند کاندنسکی



هونەرمەند جۆرج براک



هونەرمەند خوان میرۆ

## هەوڵە چاپکراوەکان

**1) لەبواری لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسیدا**

* ڕۆژنامەگەریی کوردی و ڕۆژنامەنووسی کورد
نامیلەکە-چاپی 1984، بەناوی خوازراوی
(پاکزاد محمد کریم)، چاپکردن و بڵاوکردنەوەی یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان(لەشاخ) چاپی دووەم بەناوی سەربح، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، 1991.
* پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەکوردی
لێکۆڵینەوە-گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ) بەغدا، پاییزی 1986.
* هەڵەی چاپ، ئەمڕۆ ئاسۆی دوا ڕۆژ
لێکۆڵینەوە-بەدووبەش، ڕۆژنامەی (هاوکاری) بەغدا-1988.
* وێنەو کاریکاتۆر تایپۆگرافیاو بەکارهێنانیان لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوە-بەسێ بەش، گۆڤاری (کاروان ژمارە 85 و 86 و87)ی 1990.
* برایەتی: یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا-چاپی یەکەم گۆڤاری(یەکگرتن) کە لە هەندەران دەردەچێ، چاپی دووەم چاپخانەی خەبات 1991. چاپی سێیەم چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر-1997.
* ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان(ئاداک-ADAK)
پرۆژەی دامەزراندن و بەڕێوەبردن
لێکۆڵینەوە-ڕۆژنامەی (برایەتی) بەسێزدە ئەڵقە، هەولێر-1993، چاپی دووەم بە کتێب چاپخانەی خەبات دهۆک 1997.
* درەختی بنکۆڵکراو:
پەنجەنمایێکی ڕۆژنامەنووسییانە بۆ باری ڕووناکبیری و کلتووری کوردی چاپی یەکەم کوردستان 1995، چاپی دووەم سوید 1996.
* چەند وتارو نووسینی تر هەر لەم بوارەدا لە شوێنی جیا جیا بە کوردی و عەرەبی.

**2)شیعر**

* ئەو شەوانەی خەون نایێ:

چاپخانەی (النعمان)نەجەف-1977.

* تاڤگەی مەند

چاپخانەی (شفیق) بەغدا-1987

* چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی:

چاپی ئیتالیا 1994

چاپی کوردستان 1995

**3)لەبواری وەرگێڕاندا**

*نووستوی بەر باران:

شیعر-لە فارسییەوە، چاپخانەی (علاء)بەغدا-1980

* ڕێگاوبان، پێنج چیرۆکی درێژو شانۆنامەیەک لە نیکۆلای خایتۆڤەرە

چاپخانەی (الحوادث) بەغدا-1983

* سەرتاییەک بۆ تێگەیشتنی هونەری تەشکیلی

چاپخانەی(حسام) بەغدا 1986

*چەند نامەیەک بۆ تارانتابابو:

شیعری نازم حیکمەت، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە.

چاپخانەی (الزمان)بەغدا-1990.

* دایکی کورد-دانییێل میتران

وەرگێڕان لە عەرەبییەوە 1996.

**4)**

* پاییزی چاوەکان

کۆلاژ لە تاراوگەی شیعردا چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری-هەولێر 1998.

* چاوەکان.. هەمیشە چاوەکان...

کلاو ڕۆژنەیەک لە شەختەدا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری 1999

* شرفە-بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی خەبات دهۆک-1998

* بێجگە لە دەیان شیعری وەرگێڕدراو و نووسینی دیکە لەکات و شوێنی جیاجیادا بەکوردی و عەرەبی.

